# هەقتە بزانی؟

ژان پۆل مارت





وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:

**شێرزاد حەسەن**

ژان پۆل مارتۆز

# هەقتە بزانی؟

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:

شێرزاد حەسەن

ناوی کتێب: هەقتە بزانی؟
لە بڵاوکراوەکانی: فیدراسیۆنی ڕۆژنامەنووسانی جیهانی (برەسێلس ١٩٩٢)
نووسینی: ژان پۆل مارتۆز
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن
بڵاوکراوەی ئاراس - ژمارە: ٦٤٦
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ھاوتا هیوا
دەرهێنانی بەرگ: مریەم موتەقییان
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
چاپی دووەم، هەولێر - ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٩٥٥)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

# سەرەتا

ئێمەی کورد بەقەد میللەتانی دیکەی دونیا و، ئەگەر نەڵێم لەوانیش پتر، پێویستمان بە ڕۆژنامەی ئازاد هەیە، ساڵانێکی زۆرە کە لەژێر زەبر و زەنگ و ترسی سانسۆردا هەناسە دەدەین، نەمانوێراوە یان نەیانهێشتووە بوێرین بەچرپەش بدوێین، وتوویانە «دیواریش گوێی هەیە»، بڵندگۆی ئازاد، لاپەڕەی سەربەست، سەکۆی ئازاد دەمانگەیەنێ بەو خەونانەی چەندین ساڵە خۆمانی بۆ ئامادە دەکەین کە بێنە دی، ئێمە ئەگەر لە سەربەستی نەترسین و بمانەوێ خۆ ئامادە بکەین ئەوە جگە لە ترس و دیلیەتی و دوودڵی هیچی کە نادۆزینین، لە وتنی حەقیقەتدا تەنیا پیاوە درۆزنەکان لێمان دەتۆرێن، ڕۆژنامەگەریی کوردی تا ڕۆژی ئیمڕۆش بڕوای بە گەورە و بچووکی هەیە، بە ئاغا و کرمانج، بە پێشەوای فەرماندە و سەربازی ملکەچ و  گرگن و فەرمان پێکراو، تا ئێستاش ڕۆژنامەی کوردی و هەموو کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەو پەڕی شەرم و ترس و دوودڵییەوە کار دەکەن، هەتا ئەو حزبانەی خۆ بە هاوچەرخ دەزانن لە ئەدەبیاتی سیاسی و لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان و گشت بڵاوکراوەکانیان، لە ڕێی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانیانەوە مەرایی و موغازەلەی هێز و لایەنە پاشکەوتووەکان دەکەن، عەقڵی سەلەفی و بەسەرچوو ڕێنیشاندەرە، ڕۆحی باوك سالاری (پاتریارکی) پێمان دەڵێ: لە بەردەم گەورەکانا شەرم بتانگرێ، هەموو پەردە هەڵماڵینێك لەسەر حەقیقەت با قازانجی هەموو میللەتیشی تیابێ، گەر دڵی لێپرسراوێك یان سیاسەت بازێك بتۆرێنێ، ئەوە بە حەیابردن، بەبێ شەرمی، بە پێ درێژی لە قەڵەم دەدرێ، چەند ئەستەمە لە سەدەی بیستەمدا، پیاوانی سیاسەت،

وەزیر و پەرلەمانتار و بەڕێوەبەرەکان لێمان ببنەوە بەباوك و پێمان بڵێن: دەبێ عاقڵ بن! هەر بۆیەشە ڕۆژنامەی کوردی تا بڵێی شەرمن و ترسنۆك بووە، چونکە هەمیشە باوکەکان چاو لە کوڕە لاسارەکان سوور دەکەنەوە و دەمکوتکردن و خنکاندن و کپکردنی دەنگە دلێرەکان دروشمی سەرەکی بوون، خۆ ئەگەر ڕێك بکەوێ چەند منداڵێکی چەتوون و لاسار و حەیا بەرەو حەقیقەت درکێن لەدایك بن؛ ئەوە هەر لە بێشکەکاندا دەیانخنکێنن، یان سەدان ناو و ناتۆرەی ناشیرنیان لێ دەنێن، ڕۆژنامەنووس ئەو منداڵە پاکەی ناو چیرۆکەکەی «ئەندرسن»ە کە لە چیرۆکی «بەرگی ئەفسوناووی»دا بەپادشا بێ دەکەنێ و پێی دەڵێ «گەورەم تۆ ڕووتی»، (لە کاتێکدا هەموو وەزیر و گزیرەکانی لەگەڵ بەرگدرووەکە درۆی لەگەڵدا دەکەن و پێی دەڵێن: «تۆ جلێکی ئەفسووناویت لەبەرە!» ئیمرۆ لە کوردستاندا، ڕۆژنامە و گۆڤاری بێشومار دەردەچن، بەڵام چەندیان توانیویانە خۆ لەو ترس و شەرمە ڕزگار بکەن، چەندیان پێیان سەلماندووین کە بەڕاستی «دەسەڵاتی چوارەم»ن، هەنووکە لە دونیادا گەیشتن بە سەرچاوەکانی زانیاری و حەقیقەت و پەردە هەڵماڵین لەسەر شتە شاراوەکان بووەتە فەلسەفەی زۆربەی ڕۆژنامەنووسان، ئەوان پایەکانی عەرش و تەخت و تاراجی زۆر لە پادشاکان دێننە لەرزە، ڕاستە لە زۆر وڵاتیشدا فرۆفێڵی یاسایی هەیە تا سەربەستی و ماف و هەقەکانی ڕۆژنامەنووسان لە قاڵب بدەن، بەڵام ئەوان وازیان لەو جەنگە پیرۆزە نەهێناوە کە دەبێ بیبەنەوە، ئەوان هەوڵی ئەوە دەدەن هیچ حەرامێك لە نێو دونیای ڕۆژنامەگەریدا نەهێڵن، ژیانی تاکەکانی کۆمەڵ، بگرە شتە هەرە تایبەتییەکانیان تا دمگا بە نامەکانیان گەر نهێنی و حەقیقەتێکی وایان تیابێ کە بە درکاندنی ڕۆژنامەنووس قازانج بە میللەتەکەی بگەیەنێ، ئەوە دەبێ یەك و دووی لێ نەکات، پیاوی گەورە و بچووك لە نەزەر ڕۆژنامەنووسدا هیچ مانایەکی نییە، هەموو چەکمەچە نێو دۆلاب و

ئەرشیفی کۆن و نوێی نێو دەزگاکانی میری - ش دەبێ والا و کراوە بن، ڕۆژنامەنووس لە ولاتانی دیموکراسی و شارستانییدا هەقی خۆیەتی لووت لە کاری دەوڵەتەوە بژەنێ، بۆی هەیە هەموو کەس و لایەنێك بکات بەسەرچاوەی زانیارییەکانی خۆی، بێ حیکمەت نییە کە دەسەلاتداران لە ڕۆژنامەنووسان دەترسێن، هەر بۆیە هیتلەر وەزیری ڕاگەیاندنەکەی «گۆبلز» بوو کە بەو وتەیەی بەناوبانگە، «هەر کاتێ کە گوێم لە وشەی ڕۆشنبیری دەبێ دەست بۆ دەمانچەکەم دەبەم». بە کورتی و بەکوردی گەر بمانەوێ هەنگاوێکی دیکە ڕووەو شارستانییەت بچین دەبێ تۆزێ جورئەت پەیدا بکەین و ئەو حەرامانەی کە میراتێکی کۆنن و لە سەربەستیی عەقڵ کەم دەکەنەوە تووڕی هەڵدەین، ئەو ڕۆحە نەترسەش لە ڕۆژنامەگەریی کوردییدا بە شەو و ڕۆژێك پەیدا نابێ، جەنگێکی درێژخایەنە و دەبێ ئەوەی نوێ بەبیرێکی هاوچەرخانەوە و بەچەکێکی تازەوە خۆی بۆ ئامادە بکات، با دروشممان ئەوە بێ کە هەقی خۆمانە هەموو شتەکان بزانین، دەنا زۆر زەحمەتە بڕیاری ڕاست و ڕەوان لەسەر هیچ مەسەلەیەکی چارەنووسسازی ڕامیاری، ئابووری، کۆمەلایەتی بدەین. هەر بەم مەبەستە پیرۆزەوە حەزمان کرد، یەکێ لە ڕاپۆرتە هەرە بە بایەخەکانی نێو دونیای ڕۆژنامەگەری لەسەر ئاستی جیهانی بکەین بەکوردی، تا هەموو لایەك بزانێ گەیشتن بە ڕۆژنامەیەکی سەربەست جەنگێکی سەرتاسەری و نەبڕاوەیە کە دەبێ ئێمەش لەو جەنگەدا جەنگاوەری دلێر بین، دەنا هەر لە ئێستاوە هەموو شتێك دەدۆڕێنین.

وەرگێڕ

# پێشەکی

وردبوونەوە لەو ئامراز و پێویستییە شەرعییانەی کە ڕۆژنامەنووسان گەرەکیانە بۆگەیشتن بەهەموو سەرچاوە و دەروازەکانی زانیاری لە چەند وڵاتێکی هەڵبژاردەی جیهانیدا، بەر دیدەمان ڕۆشنتر دەکا بۆ تێگەیشتن لە ئامانجە سەرەکییەکانی دونیای ڕۆژنامەگەری، بەم پێیەش حەقیقەتێکی زۆرترمان دەستگیر دەبێ. ئەم باسوخواسە لە وەختێکی ناسکدا دێتە گۆڕێ، سەروەختێکە کە بۆ ڕۆژنامەنووسان گەلێ بایەخدارە.

فیدراسیۆنی یان یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی جیهانی (IFJ) لە ساڵی (١٩٩١)دا مەرگی واتە کوژرانی (٨٤) ڕۆژنامەنووسی ڕاگەیاند کە بە درەندانەترین شێوە کوژرابوون، کە هیچ وەخت و سەردەمانێك نەگەیشتووەتە ئەو ژمارە گەورەیە. زۆربەی ئەوانەی کە کوژران بوونە کۆچی قوربانی تەنیا لەبەر ئەوەی کەوتبوونە پرسیار و سۆراغ و پشکنین و گەڕان بەدوای زانیاریدا کە دیارە ئەو گرووپە بەهێزانەی دەسەڵاتیان هەبووە لە ترسی بەرژەوەندیی خۆیان ڕێیان بەو ڕۆژنامەنووسانە نەداوە لەو چەشنە هەوڵانە بەردەوام بن، هەندێ لەوانەی دەستیان لە کوشتنی ڕۆژنامەنووسەکاندا هەبووە پیاوانی سوپا بوون، یان تاوانباران و تیرۆرکەران بوون: ئەوانە قەت نەیانویستووە هیچ زانیارییەکی پێویست و ڕاستەقینە بڵاوبێتەوە.

کاتێ یونیسکۆ داوای لە «یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی جیهان» کرد لەم کارەساتی کوشتن و بڕینەی ڕۆژنامەنووسان بکۆڵنەوە ئێمە بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە ئامادە بووین هاریکارییان بکەین، ئەوەیان هەلێکی ڕەخساو بوو تا بتوانین پتر پێ لەسەر ئەو مافانە دابگرین کە

ڕۆژنامەنووسان هەیانە یان دەبێ بیانبن، لەگەڵ دەستنیشانکردنی هەموو ئەو کۆت و بەند و یاسایانەی کە بازنەی سەربەستییان تەسکتر دەکاتەوە.

ئێمە ڕۆژنامەنووسان ڕۆڵێکی کاریگەر و زیندوومان هەیە، سەبارەت بەهەموو ئەو مەسەلە و کێشانەی کە ئیمڕۆ مشتومڕیان لەسەرە، جا چ لەناو نەتەوە یەکگرتووەکاندا یان هەر شوێنێکی دیکەدا، وەختێ باس لە سیستەمی نوێی جیهانی دەکرێ، بەتایبەتی کە مەسەلە دێتە سەر دیموکراسی و شێوەکانی ڕاگەیاندن. وێڕای هەموو شتێکیش ڕۆژنامەنووسان ویلەکانی ماشێنی دیموکراسی چەور دەکەن، زەمینە بۆ ئەو زانیارییانە خۆش دەکەن کە پرۆسەی دیموکراسییەتی لەسەر بەندە.

ڕۆژنامەنووسان بە مانا هەرە فراوانەکەی پێناسەی «سەربەستیی چاپەمەنی» دەکەن کە بەتەواوەتی هەموو دەروازەکانی زانین و زانیارییان لە بەردەم واڵا بکرێ، بەشێوەیەك کە زۆر بە وردی و دیقەتەوە، زۆر بە مەعقولیەتەوە وێنەی ئەو کۆمەڵگایە پیشان بدات کە تیایدا کاردەکەن.

شانۆنووسی ئەمریکی «نارسەر میللەر» وتوویەتی: «ڕۆژنامەی چاك واتە میللەتێك لەناو خۆدا یەکتر دەدوێنن» کۆمسیۆنی شاهانەی بەریتانیا ـ ش هەمان بۆچوونی هەبووە کە لە ١٩٧٧دا پێناسەی سەربەستیی چاپەمەنی بەم شێوەیە کرد: «سەربەستییەکی وابێ کە لە هەموو کۆت و بەندێك بەدوور بێ و بۆ خاوەنانی دەزگاکانی چاپەمەنی و سەرنووسەران و ڕۆژنامەنووسان بەردی بناغەی کارکردن بێ تاوەکو بتوانن بایەخ و سەرنجی جەماوەر پتر بەرەو لای کێشەکان ڕابکێشن، ئەوەشیان بەرێگەی بڵاوکردنەوەی هەموو حەقیقەت و ڕا و بۆچوونە جیاکان کە دیارە بەبێ ئەوە هیچ کەسێکی دیموکراتی کە مافی دەنگدانی هەبووە ناتوانێ دەنگی ڕاست و ڕەوان و بەرپرسیارانەی خۆی بدات».

ئـەمـەیـان سەرەتـایـەکـی زۆر پـێویستـە بـۆ دەستـپـێکـردنـی ئـەم جۆرە توێژینەوەیە و پێداچوونەوەیەکیشە بەسەر هەموو دەروازە گشتییەکان کە ڕۆژنامەنووسان دەستیان بگاتێ وەك سەرچاوەکانی زانیاری.

بۆ ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە ببێ بەنموونە و دەرکەوتەی ئەو حاڵەتەی ئێمە مەبەستمانە (فیدراسیۆنی جیهانی بۆ ڕۆژنامەنووسان« دە وڵاتی هەڵبژارد کە سەر بەگیشوەرە جیاکانی جیهانن و هەریەکە پێکهاتە و ڕێسا و یاسای تایبەتی خۆی هەیە. لەوانەش: دانیمارك و بەریتانیا و فەرەنسا لە ئەوروپا، سینیگال و زیمبابۆی لە ئەفریقا، فەنزوێلا و پیرۆ لە ئەمریکای لاتین، وڵاتە یەککگرتووەکان لە ئەمریکای باکوور، یابان و مالیزیاش لە ئاسیا.

ئەو وەڵام و بەرەنجامانەی لەو پشکنین و ڕوو پێوکردن و لێکۆڵینەوانەدا کە بەیارمەتیی (ژان پۆل مارتۆز) ، سەرنووسەری «دیمانکی ماتن» لە «برەسێلس» دەستگیرمان بووە کە یەکێکە لە پەیامنێرە جیهانییە ناودارەکان و خەڵکی بەلجیکا. بە هەتا بڵێی بەرەنجامی سەیر و سەرنجڕاکێشن، بەڕادەیەك کە هەموو کەسێك پێی بوورووێژێ ڕەنگە یەکێ وا زەن بکات کە هەموو حکوومەتەکان لە ساڵی (١٩٩٠)ەوە هەوڵی ڕاستەقینەیان دابێ کە سەربەستی بەخشین و وەرگرتنی زانیاری یا بڵاوبوونەوەی ڕاستییەکان مەیسەر بکەن، بۆ پەرتبوونی هەواڵەکان هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك نەمێنێ، تا بکرێ پتر ڕۆژنامەنووس ئازایانە و پیشەگەرییانە لە کار و فەرمانی خۆی نزیك ببێتەوە و بیکا بەخەمی سەرەکی، تا بێ ڕا و بۆچوونی جیاواز لە هەموو کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، بەهەموو خەڵکی بگەیەنێ. ئەم گۆڕانەش کەی؟ دوای ئەوەی هەموو ئەو حکوومەتانە قورساییی ئەو وێرانکارییانەیان کە سانسۆر دروستی کردبوون کە وای لێ هاتبوو گەیشتن بەدەروازەکانی زانینی ڕاستییەکان ببێ بە مەحاڵ، بەتایبەتیش لە لایەن ئەو ڕژێمە تاکرەو و دکتاتۆرییانەی

ئەوروپای ڕۆژهەلات و هەندێ ولاتی تر کە بەڕاستی دەستیان نابووە بینەقاقای هەموو شێوەکانی سەربەستیی چاپەمەنی و بلاوکردنەوە.

بەلام بەداخەوە وا دەرنەچوو، ئەو حکوومەتانە نائومێدیان کردین، گەرچی سەدەها بەڵگەنامە و ڕاگەیاندن و پەیمان و ڕێککەوتننامەی شەرعی هاتنە کایەوە بەو نیازەی ئەم ئامانجانە بێننە دی، کەچی لەولاوە ناوەندە دەسەلاتدار و بەهێزەکان ڕۆژانە کۆسپ و تەگەرەیان دەخستەوە بەردەمی گەیشتن بە دەروازەکانی زانیاری لە ڕێگەی دەیەها فرۆفێڵی تەکنیکیی واوە کە نوشوستی و هەرەس بەهەموو چالاکییەکانی ڕۆژنامەنووسانی ئیشکەر بگەیەنێ.

بەلام لە پرۆسەیەکی ئاوادا، هەر بەتەنیا ڕۆژنامەنووس ناتلێتەوە و نابێ بەقوربانی، لەوە بالاتر ئەوەیە کە هاونیشتیمانییەکی سادەش بەقوربانیی ئەو دیزە بەدەرخۆنەیە، هەر کاتێ چاوپۆشی لە حەقی زانین بکرێ، ئەوە بزانە بەدوای ئەوەدا پێکهاتە و شیرازەی دیموکراسییش لێکدی دەترازێ.

مێژوو پێمان دەڵێ: هەموو قەوارە سیاسییە تاکرەوەکان لە کۆمەڵگاکانی خۆیان دادەبڕێن، هەمان شت سەبارەت بە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن کە سەر بەو جۆرە سیاسەتەن. کاتێ قازانج و بەرژەوەندییە ڕامیاری و ئابوورییەکان لە بازنەیەکدا یەك دەگرنەوە و یەکەم داخوازی لە هەموو دونیادا ئەوە دەبێ هەر هەموو هەواڵ و ڕیپۆرتاژەکانیش بەڕاشکاوی و ڕاستەوخۆ و ڕەخنەگرانە سەبارەت بەکێشەکان ئامادە بکرێ کە دەبێ بە بناغەیەك بۆ دیموکراسی.

ئایدەن وایت

سکرتێری گشتی برەسێلس

بەفرانباری/١٩٩٢

## ١- پێناسە و پرنسیپە گشتییەکان

• هەنوکە سەربەستیی ڕادەربڕین، لەسەر ئاستی هەموو دونیادا بووەتە مافێکی ئاشکرا و پارێزراو. بەهێزترین دان پیانانیش بەو هەقە لەو بەندە بەناوبانگەدا بەرجەستە بوو کە لە جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ ـ لە ساڵی (١٩٤٨) بەندی ژمارە (١٩)ی دراوەتێ.

بەڵام سەربەستیی ڕادەربڕین ئەوە ناگەیەنێ کە هێز و دەسەڵاتمان تەنیا بۆ ئەوە بێ ڕا و بۆچوونی دژ بەحکوومەت ڕابگەیەنین، بەڵکو دەبێ دەسەڵاتەکە بۆ ئەوە بێ بەدوای ڕا و بۆچوونی تازەدا بگەڕێین «جۆن کین، میدیا و دیموکراسی، چاپخانەی پۆلیتی ـ ١٩٩٩، کامبرج» بەهەمان شێوە: وەك چۆن هەقی زانین پابەست و ئەنجامێکی سروشتیی هەقی دەربڕینە، هەروەها هەقی پاراستنی نهێنییەکان ئەنجامێکی سروشتییە بۆ هەقی زانین. نە دەوڵەت و نە ڕێکخراوەکانی تر، نە هیچ جۆرە خەڵکێك بۆیان نییە، خۆ لە کاروبار و ژیانی تایبەتی هاووڵاتییان هەڵقورتێنن.

بناغەی مەنتیقی کە ئەو «هەقی زانینە»ی لەسەر بەندە، فرانکلن ئێس هایمن جوان تەعبیری لێ کردووە کاتێ کە دەنووسێ «زۆربەی ئەو زانیارییە بنەڕەتییانەی کە لە دەستی نوێنەران و فەرمانبەرانی میری دان کە دەتوانن ڕێ لە پرۆسیسی دیموکراسی بگرن و ئەو زانیارییانە بکەن بەداردەستی خۆیان و هەر بابەتێك کە بەشیاوی بزانن و لەبەرژەوەندی ئەواندا نەبێ، خەڵکی بیزانێ وەك نهێنی لای خۆیان هەڵیدەگرن».

گەرچی لە بنەڕەتدا هەموو ئەو ڕاستییانەی کە حکوومەت لە چنگێکی نووقاودا شاردوونییەوە موڵکی ئەو خەڵکەن، کۆکردنەوەی هەموو زانیاری و بابەت و حەقیقەتەکان بەپارەی ئەو کەسانە بووە کە باج و

خەراجیان داوە، لە ڕێگەی ئەو دەسەڵاتەی کە لە گەل و میللەت وەرگیراوە، چییان بوێ و چۆنییان بوێ، وادەکەن.

ئەوە دەچێ بۆ چەندەها ساڵ ڕۆژنامەنووسەکان هەوڵی ئەوەیان داوە کە دەروازەی چاکتر بۆ کۆکردنەوەی زانیاری بدۆزنەوە و بتوانن هێرش بەرنە سەر هەموو ئەو پانتاییانەی کە حکوومەت بە هی خۆی دەزانێ، ئەمەیان تەنیا حەقێك نییە کە بدرێتەوە بەڕۆژنامەنووسەکان، بەڵکو ئەم هەقە هەقێکی گشتییە کە دەبێ بخرێتە سەر دەسەڵاتی هەموو کۆمەڵگا: دەسەڵاتی گەیشتن بەڕاستییەکان. هەر ئەم هەوڵەشە دەبێ بەئامرازێکی چاکی ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەرشانی ڕۆژنامەنووسان، یاساو دەستووری کۆمەڵەی چاپکەرانی نەرویجی بەئاشکرا ڕوونی کردووەتەوە «ئەرکی چاپخانە و دەزگاکانی بڵاوکردنەوە، گەیاندنی هەموو ئەو زانیاری و حاڵەتانەیە کە لە کۆمەڵگەدا هەن، پەردە لەسەر هەموو مەسەلە و کێشەکان هەڵدەدەنەوە کە بهێنێ ڕەخنەیان لێ بگیرێ».

کارکردنی ڕۆژنامەگەریانەی پوخت بەپێی دەستووری یەکێتی ڕۆژنامەنووسانی فینلەندا لەسەر هەقی هەموو هاووڵاتییەك بنیات نراوە، هەقی وەدەستهێنانی زانیاریی ڕاست و دروست و هەقی ڕەخنەگرتن لەسەر ئەو ئەساسەی کە هاووڵاتی وێنەیەکی دەقاودەقی ئەو دەورووبەرەی دەست بکەوێ کە تیایدا دەژی. بۆ سەرخستنی ئەم ئامانجە دەبێ ڕۆژنامەنووس هەقی وەدەستهێنانی هەموو زانیارییەك و بڵاوکردنەوەی هەبێ، بەندەکانی کارکردنی کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسانی ئەمریکی کە لە ساڵی١٩٦٢دا سەلمێندران و لە ١٩٧٣دا پێیداچوونەوە و لە ساڵی ١٩٨٤ سووربوون لەسەر ئەوەی کە:

«ڕۆژنامەنووسەکان بەدوای ئەو هەواڵانەدا دەگەڕێن کە لە خزمەت بەرژەوەندیی هەموو لایەك بن. گەرچی کۆسپ و تەگەرەش لەو ڕێگەیەدا

زۆر بێ. ئەوان هەوڵی بەردەوام دەدەن کە مەسەلە و کاروباری خەڵکی بەئاشکرا و لەبەر چاویان بگیرێ و هەموو حاڵەتەکان کە پەیوەندییان بەژیان و گوزەرانی خەڵکەوە هەیە بکەونە بەر لێپرسینەوە و توێژینەوە و پشکنینی هەموو کەسێك، واتە خەڵکی دادوەری هەموو مەسەلەکی یەکدی بن.

لە گەلاّرێزانی ۱۹۷۳ دا کۆمەڵێ ڕۆژنامەنووس و نووسەران لە لایەن «یونسکۆ»وە لە پاریس کۆنگرەیەکیان بۆ ڕێکخرا کە تیایدا لە پرۆتۆکۆڵێکدا یەکیان گرتەوە کە لە ژێر سەر دێڕی «دەروازەیەك بۆ سەرچاوەکان» دا دەڵێ:- «هەر ڕۆژنامەنووسێك لە میانەی ئیشی خۆیدا دەبێ هەقی تەواوی هەبێ لەوەی دەستی بگات بەگشت سەرچاوەکانی زانیاری، بەتایبەتی ئەو زانیارییانەی کە کارتێکەریی ڕاستەوخۆیان بەسەر ژیان و کێشەکانی خەڵکەوە هەیە. لە میانەی ئەو کۆبوونەوەیەدا ئەو پێشنیارە خرایە بەردەم کە گەیشتن بەزانیارییەکان، بەتایبەتی بۆ پەیامنێرە بیانییەکان، یا لە ڕێگەی هەڵگرتنی کارتی ڕۆژنامەگەریی جیهانییەوە بێ. لەپاڵ ئەوەشدا بەشداران ئەم مەسەلەیان بەستەوە بەمەسەلەیەکی دیکەوە کە ئەویش «نهێنیی پیشە»ی پێ دەوترێ. خاڵێکی دیکە ئەوەبوو کە دەبێ خەڵکی بتوانن سەربەستانە هەموو زانیارییەکی پێویستیان دەستگیر بێ، بەمەرجێك لە چەندین ڕوانگەی جیاوازەوە لە جۆرەها سەرچاوەی بەربلاّودا ئەم زانیارییانە کۆ بکرێنەوە، تا ئەو سەر و حەدەی کە شیاوە، چەندیش بکرێ یەك سەرچاوە و یەك ڕاپۆرت نەکەین بەبناغەی زانیارییەکانمان.

لە ساڵی ۱۹۷۱ نوێنەری شەش یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی کۆمەڵگەی ئەورووپی لە «میونخ» کۆبوونەوە و «جاڕی ئەرك و مافەکانی ڕۆژنامەنووسان» یان ڕاگەیاند و لەو ڕاگەیاندنەدا هاتبوو:

«ڕۆژنامەنووسان داوای ئەوە دەکەن کە هەموو ڕێگەیەکیان بۆ خۆش بکرێ بۆ دەسڕاگەیشتن بە هەموو سەرچاوەکانی مەعلومات و حەقی ئەوەشیان هەبێ کە سەربەستانە لە ڕاستیی هەر مەسەلەیەك بکۆڵنەوە کە پەیوەندیی بەژیانی خەڵکەوە هەبێت.»

ئەم ڕاگەیاندنە پتر تەئکیدی لەسەر ئەوە کردەوە کە هەقی زانینی هەموو شتێك بۆ ڕۆژنامەنووسان هەقێکی تاك و ڕەوا بێ. لەسەر ئەساسی ئەوە کە نیاز و مەبەستی ڕۆژنامەنووسان لە پێشدا زانراوە کە مرۆڤانەیە. هەندێ لە یەکێتیی ڕۆژنامەنووسان هەقی پتریان خواست، بەوەی کە دەزگایەکیان بۆ دابمەزرێ کە «هەقی زانین» لەوێدا بەرکەماڵ بێ.

لە بەفرانباری ١٩٧٣دا چوار کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسانی فەرەنسی لە «سین» دەستوورێکی تازەیان ڕاگەیاند کە پێی دەوترێ «دەستووری مافی زانین»:

«لە کۆمەڵگای تازەدا سەربەستیی چاپەمەنی بەتەنیا زامنی گەیاندنی زانیاری بەخەڵکی ناکات. لە ڕۆژی ئەمڕۆدا پێویستییەکی تازە هاتووەتە کایەوە کە هەمیشە لای هەمووان مەتڵەبە، ئەویش زانینە. زۆربوونی سەرچاوە جۆراوجۆرەکانی زانیاری، هێز و توانست و ڕەنگاوڕەنگیی کەناڵەکانی بەیەکگەیشتنی جەماوەر، پێویستیی هەقی هەڵبژاردنی تاکە کەسی و گشتی لە هەر بوارێکدا کە بوار و ڕێگە بڕەخسێنێ کە هەموو کەسێك بۆی هەبێ ئاگای لە هەموو هەقیقەتە ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکان هەبێ، کە پەیوەستن بەیەکەوە، جگە لەو هەقەی کە زانینی هەموو شتێك بۆ هەر هەمووان ڕەوا بێ، کە وادەکا جارێکی تر ئەم هەقە بێنێتەوە بەدەستوور. گەیشتن بەزانیارییەکانیش ئەنجامێکی سروشتی و پابەندە بەسەربەستیی ڕادەربڕین جا چ بە زار و چ بە نووسین.»

دەستوورەکە دەڵێ ئەم هەقە لە وەدا بەرجەستە دەبێ کە ڕۆژنامەنووس سەربەستیی کۆ کردنەوە و وەرگرتن و ئاڵوگۆڕ و بڵاوکردنەوەی

زانیارییەکان و بیر و باوەڕەکانی هەبێ، بەپێی ئەم پرنسیپانەی خوارەوە.

* سەربەستیی گەیشتن بەهەموو سەرچاوەکانی زانیاری.
* ئەرکی هەموو هێزە جەماوەرییەکانە کە ئەو زانیارییانەی دەستیان کەوتووە بڵاوی بکەنەوە، نابێ **هیچ** جۆرە سانسۆرێکی **ڕاستەوخۆ** یان **ناڕاستەوخۆیان** لەسەر دابنرێ.
* **یاسایەک** دەربچێ کە دان بەوەدا **بنێ** ڕۆژنامە**نووس** مافی **هەبێ** ناوی **ئەو** سەرچاوانە نەدرکێنێ کە **زانیارییەکانی خۆی** بەنهێنییەوە لێ **وەرگرتوون**.

**لە** هەندێ ولاتی وەك فینلەندا **هەقی زانین** ـ لە دەستووری دەوڵەتدا جێی **بۆ کراوەتەوە و دەلیلیشە** بۆ کار**کردنی** بوختی هەموو ڕۆژنامەنووسێك. **هەموو** ولاتە ئەسکەندەناڤییەکان **پرنسیپێکیان** هەیە کە دەڵێ دەبێ لە هەموو مەیدانەکانی بەڕێوەبردن **و کارگێڕیدا**. پەردە لەسەر هەموو مەسەلەیەك **هەڵبدرێتەوە**، ئەمە**شیان وا** دەگەیەنێ کە لە نێو هەموو شتەکانی دیکەدا کە ئاشکرا **و سەر والایە**، دەبێ گشت بەڵگەنامە و دۆکیۆمێنتە حکوومەتییەکان **کە لای دەسە**لاتدارانی دەوڵەتن بکەونە بەردەستی جەماوەر. نەك هەر **ئەوە**. **بگرە** دادوەرییە جەماوەری و **گشتییەکانیش** لە فینلەندا، سوید، نە**رویج و دانیمارك** بووەتە یاسایەکی باو.

هەروەها پاراستنی سەرچاوە **ڕۆژنامەگەرییەکان**، لە هەموو ولاتانی ئەسکەندەناڤی، لەسەر هەمان **پرنسیپ** دامەزراوە لە ولاتی سوید، یاساکە زۆر پێشکەوتووترە کە تیایدا ڕۆژنامەنووسان بەتەنیا ئەو هەقە **داوا** ناکەن کە سەرچاوەکانی زانیاری مەرجە نهێنی بن و کەس پێیان نەزانێ، بەڵکو ئەرکی سەرشانی هەمووانە کە ئەم نهێنییە بپارێزن. (بڵاوکردنەوەی هەقیقەت و نهێنی ڕەوایە، بەڵام درکاندنی سەرچاوەکانی وەرگرتنی نهێنییەکان قەدەغەیە ـ وەرگێڕ).

هەتا ئێستاش «هەقی زانین» لە نێو ڕۆژنامەنووسان و ئەوانەی کە یەکەمجار زانیارییەکانیان لەلا بوو **گفتوگۆ** و دەمەتەقێی لەسەرە، بەڵکو لە نێو کۆمەڵگەی ڕۆژنامەنووسانیشدا، هەمان گفتوگۆ و کێشە گەرموگوڕ مستەر (ئیڤریت دێنس) لە بەشی لێکۆڵینەوەی سەربەستیی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن - زانکۆی **کۆڵۆمبیا** لە نیویۆرك، دەڵێ: «**بزووتنەوەی** سەربەستی زانین (FOI) گەلێك **ئەنجامی** باش **و پۆزەتیڤی هەبوو، گەلێك** یاسای **جەوهەرداری** هێنایە **کایەوە**. لەوانە «بوونی **دانیشتن و** کۆبوونەوەی کراوە و تۆماری **تەشریعاتی گشتیی** کراوە، لەپاڵ **چوونە** ناو گەلێ کۆبوونەوەی **میری - حکوومەتی** کە **پێشووتر** لە **جەماوەر و** کەناڵەکانی ڕاگەیاندن **قەدەغە کرابوون**. بزووتنەوەی سەربەستیی **زانین** - یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی **جیهان**-ی شتێکی **پێویستیی** و **هەم جێی** مەبەست و ئارەزووی **هەموو لایەك** بووە، **بەڵام ڕۆژنامەنووسان** بەوەندەش نەوەستان، **گەلێك** هەق و هەقی **تریان** بۆ خۆیان **پچڕی**. **هەندێ** لەو ڕۆژنامەنووس و پەیامنێر و **ڕیپۆرتاژ**کارانە داوای **ئەوەشیان** کرد کە دەبێ لەمەودوا **ڕێیان** پێ بدرێ **بەنێو** هەموو کاغەز و نامە و نووسراوە هەرە تایبەتییەکانی هەندێ کەسی زەروورردا بگەڕێن و بیانخوێننەوە، ئەگەر «گەڕان بەدوای حەقیقەتێکدا» ئەم سۆراغ و پشکنینەی گەرەك بوو، هەمیشە وایان ڕادەگەیاند کە «**نهێنیی** شاردنەوە» کۆسپێکی زۆر هیچ و بێ مانا و نادروستە بۆ گەیاندنی **هەقیقەت** بەجەماوەر لە ڕێگەی چاپەمەنییە جۆراوجۆرەکاندا.

لە ڕاستییدا دەستنیشان کردنی مەودای «هەقی زانین»، مەسەلەیەکی زۆر ناسکە. هەر سنوور دانانێك بۆ هەر حکوومەتێك، لەوەی چی بڵێ و چی بشارێتەوە لە «فەلسەفەی هەقی زانین» کەم دەکاتەوە.

«فرانکلن. ئێسە هایمان» کە یەکێکە لە پسپۆڕانی پەیوەندی و ئاڵوگۆڕ، چوار خاڵی هەڵاوێردی هەژمار کردووە:

* زەروورەتی پاراستنی هەندێ نهێنی و بەرژەوەندی و قازانجی شەرعیی ئەو کەسانەی کە زانیارییان دەربارەی کۆکراوەتەوە.
* دڵنیابوون لەوەی کە لە هەموو پرۆسێسەکانی گەڕان و پشکنیندا بەو پەڕی هێمنی و لەسەرخۆ هەنگاو هەڵدەنێین.
* پاراستنی سوود و قازانجە ئابوورییەکانی جەماوەر.
* پاراستنی سەلامەتیی گیانی یەکەکانی کۆمەڵ و هەموو دەزگاکانی.

هەندێ لە خەڵکان بڕوایان وایە کە چاپەمەنی دەبێ لە بەرژەوەندی هەموو جەماوەردا بێ و «هەقی زانین» بکا بەدروشمی خۆی. هەر دەبێ خۆیشی لەسەر هەموو جۆرەکانی ڕاگەیاندن بڕیار بدات.

«ئیڤرێت دێنس»، بڕوای وایە کە «ئەگەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەگەری بەپێی مەبدەئی گشتیی «هەقی زانین»، بیانەوێ ببنە نوێنەری ڕاستەقینەی جەماوەر، ئەوە دەبێ لە لایەن دادگا و هەموو هەیئەتەکانی تەشریعات و پەرلەمان پێیان بوترێ کەوا ئەرکی سەرشانیانە چ جۆرە زانیارییەکی تایبەت بەخەڵکی پێشکەش بکەن، ڕەنگە ئەوەیان خۆ هەڵقورتاندنێکی قورس بێ لە مەدارەکانی سەربەستیی چاپەمەنی.

## ٢- ئامانجە گشتییەکان

هەندێ لەو حکوومەتانەی کە هەنگاوی «سەربەستیی زانیاری و زانین»یان سەلماندووە و یاسایان بۆ داڕژتووە، بەئاشکرا ئەوە دەردەبڕن کە بۆ ئەم جۆرە سەربەستیی چاپەمەنییە هۆیەکی بنەڕەتی و مەنتیقی هەیە. بۆ نموونە لە ئوستورالیا ئامانجەکانی یاسای فیدڕالی سەبارەت بە سەربەستی زانیاری، ئەوەی تیایە کە لە ڕاپۆرتی ساڵانەی جێگری گشتیدا ئەو ئامانجانە نووسراون:

* پەرەپێدان و چاکردنی بڕیارەکانی میری.
* زیادکردنی هۆشیاریی جەماوەر سەبارەت بەپرۆسێسەکانی ئەو بڕیارانەی میری دەریان دەکات.
* زیادکردنی بەشداربوونی جەماوەر لە پرۆسێسەکانی ئەو بڕیار دەرکردنانە.
* بوار خۆشکردن لەبەردەم کەسەکانی نێو کۆمەڵ بۆ گەیشتن بە فایلەکانی زانیاری و ئەرشیف، سەرەڕای هەقی ڕاستکردنەوەی هەموو چەوتییەك.

لە نیوزیلەندا ئامانجەکانی بەم شێوەیە خۆ دەردەخەن:

* هەقی تەواوی لێپرسینەوە هەبێ لە کاروباری وەزیرەکان و فەرمانبەران، وابێ کە ڕێزگرتن لە یاسا تا بێ سەقامگیرتر بێ.
* پەرەپێدان بەهەموو دەزگاکانی حکوومەتی نیوزیلەندا کە ڕوو لە کەماڵ بن.

## ٣- بنەمای شەرعیی جیهانی

سیاسەتی نیشتمانی (نەتەوەیی) لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر بەفراوانی دەگۆڕێ، زۆر جار لەگەڵ بەندەکانی کۆنگرە و بەیاننامە جیهانییەکان یەك ناگرنەوە، ئەو مەرج و بەندانەی کە دەوڵەتان لە بەینی خۆیاندا لەسەریان ڕێك کەوتوون و مۆریان کردووون:

«هەقی زانین» لە بەندی ژمارە نۆزدەی جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤدا، ڕاگەیاندراوە کە تیایدا دەڵێ:

**یەکەم**: هەموو کەسێك مافی ئازادی بیروڕا دەربڕینی هەیە.

١- ئەم مافە هەقی ئەوە دەدا بەهەموو کەسێ، هەڵگری چ بیر و باوەڕێك بێ، دوور لە خۆ تێهەڵقورتانی ئەم و ئەو، هەقی ئەوەشی هەیە بەدوای

هەموو جۆرە زانیاری و هەواڵ و بیر و باوەڕێکدا بگەڕێ، وەری بگرێ و بڵاوی بکاتەوە، جا لە ڕێگەی هەر کەناڵێکی ڕاگەیاندنەوە بێ، بێ گوێدانە کۆسپ و بەربەست و سنوورە جوغرافییەکان، بەڵام ئەم پێداگرتنە زۆرە لەسەر مافەکان لە بەندی ژمارە نۆزدە و لە پەڕەگرافی سێیەمدا بەتەواوی ڕوون کراوەتەوە.

٢- کار پێکردنی ئەو مافانە کە لە پەڕەگرافی دووەمی ئەم بەندەدا ئاماژەیان پێ کراوە لە ناوئاخنی خۆیدا کۆمەڵێ ئەرك و لێپرسینەوە لەخۆ دەگرێ کەواتە دەکرێ ئەو مافانە تا ڕادەیەك سنوور بەندیش بکرێن، ئەوەش بۆ ئەوە نییە مافەکان لە کەس زەوت بکرێن، تەنیا مەبەست ئەوەیە بەرگێکی یاسایی بپۆشن، هەروەها پێویستیشە بۆ:

ئەلف: ڕێزگرتن لە مافەکان یاخود بۆ پاراستنی ناو و حەیا و حورمەتی خەڵکانی تر.

بێ: بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوە یان پاراستنی ڕیزبەندی کۆمەڵ و عەوام یان تەندروستی و ڕەوشتی خەڵکی بەداخەوە ئەم پەڕەگرافە دەتوانێ و توانیویەتی بەناوی پاراستنی ئاسایشی نەتەوە، کۆمەڵێ کۆت و بەندی قورس بخاتە سەر ئەو ڕۆحە سەربەستەی کە لە پەڕەگرافی یەك و دوودا بەرجەستە بووە.

لە بەندی ژمارە (١٩)ی ساڵی ١٩٧٦ دا و لە ڕێسای جیهانی بۆ مافە مەدەنی و ڕامیارییەکان ڕایگەیاندراوە کە «هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە ئازادانە ڕا دەرببڕێ، ئەم مافەش گەڕان و پشکنین و وەرگرتن و بڵاوکردنەوەی هەموو جۆرەکانی زانیاری و هەواڵ و بیر و باوەڕ دەگرێتەوە، بێ گوێدانە هیچ جۆرە کۆسپ و سنوور بەندییەك، هەر کەسێکیش لەوەدا سەربەستە بە چ شێوەیەك کە خۆی هەڵیدەبژێرێ دەتوانێ بیر و ڕاکانی خۆی دەرببڕێ: چ بە زار، چ بە نووسین، چ لە ڕێگەی

شێوەکانی هونەر و ئەدەبەوە بەرجەستە بێ. یان هەر جۆرە کەناڵێك کە خاوەن ماف بۆ خۆی پەسەندی دەکا.»

بێجگە لە دەستووری ئەفریقی بۆ مافەکانی مرۆڤ لە ١٩٨٦ دا، «هەقی زانین» بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە ڕێککەوتننامەی ئەمریکی بۆ مافەکانی مرۆڤ- ی ساڵی ١٩٦٩دا لە بەندی ژمارە ١٣دا وا نووسراوە:

«هەق نییە مافی ڕادەربڕین بەهیچ شێوازێك لە ڕێگەی کۆسپ و بەربەستێکی ناڕاستەوخۆ سنووری بۆ دابنرێ، نە لە ڕێگای یاسای ستەمکارانەی حکوومەت و نە دەسەڵات و زەبر و زەنگی هیچ یەکە و یەکێکی کۆمەڵگە، یان هەر شتێکی تر کە لەبەردەم ئاڵوگۆڕی بیر و ڕا و زانیاری و هەواڵدا ڕێگر بێ. دەبێ هەموو بیر و ڕا و بۆچوونەکان لە ڕێگەی کەناڵە جیاکانی ڕاگەیاندنەوە بگاتە هەموو کەسێك. هیچ بڕ و بیانوویەکیش هەقی ئەوە بە کەس نادات، ئەم مافە پێشێل بکات.»

بەڵام سەبارەت بە «پەیمانی ئەورووپی بۆ مافەکانی مرۆڤ»، کە لە ساڵی ١٩٥٠ دا لە لایەن ئەنجومەنی ئەورووپییەوە ئیقراری لەسەر کرا، لەو پەیمانەدا زۆر بەئاشکرا مافی گەڕان بەدوای زانیاری و هەواڵدا ڕوون نەکراوەتەوە، هەرچۆنێك بێت، بەندەکانی ئەو پەیمانە وەك بەندەکانی «جاڕی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ» نین؛ چونکە سەربەستیی مافی ڕا دەربڕینی بەپێویستییەکانی «کۆمەڵگەیەکی دیموکراتی» بەستووەتەوە، ئەو هەقەش دەدا بەهەموو ئەو ڕۆژنامەنووسانەی کە لە کاردان، لانی کەم لە ڕووی تیۆرییەوە، کە بۆیان هەبێ نهێنی و متمانەی ئەو سەرچاوانە نەدۆڕێنن کە زانیارییان لێ خواستوون، واتە پاراستنی نهێنی و ناوی ئەو سەرچاوانە مافی تەواوی ڕۆژنامەنووسەکانە. بەندی ژمارە (١٠)ی پەیمانی ئەورووپی وای نووسیوە:

«هەموو کەس مافی سەربەستیی ڕا دەربڕینی هەیە. ئەم هەقە ڕێگە دەدا

هەرکەسە و سەربەست بێ لەوەی چ بیر و باوەڕێك پەسەند بکات، هەقی خۆیەتی ئەو بیر و باوەڕ و زانیارییانە بڵاو بکاتەوە بێ ئەوەی حکوومەت و دەسەڵاتداران هەقی ئەوەیان هەبێ، خۆیان تێوە هەڵقورتێنن و ڕێیان لێ بگرن، بێ گوێدانە هیچ جۆرە شوورە و سنووربەندییەك. ئەم بەندە ڕێ لەوە ناگرێ کە دەوڵەت ئەوێرێ داوای مۆڵەت لە دەزگاکانی تەلەفزیۆن و سینەما و ڕادیۆ بکات.

**دووەم:** بەکارهێنان و کەڵك وەرگرتن لە شێوە جیاجیاکانی ئەم سەربەستییە کە دیارە مومارەسەکردنی ئەو سەربەستییە لەناو خودی خۆیدا کۆمەڵێ ئەرك و لێپرسینەوە هەڵدەگرێ، بۆیە دەکرێ لە دوا دەرئەنجامدا، بکەوێتە ژێر هەموو چەشنە کارتێکردنێکی یاسایی و ڕەسمی و دەوڵەتی، هەموو ئەو مەرج و سنووربەندی و سزایانەی کە لە لایەن یاساوە ئیقراریان لەسەر کراوە، بۆ کۆمەڵگایەکی دیموکراتی زۆر پێویستن، بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوە، یەکێتیی خاك و گشت ئیقلیمەکان، سەلامەتی ژیان و بەرژەوەندی گشتی. هەمووشی لە پێناو ئەوە دایە کە ڕێ لە تاوان بگیرێ و ئاژاوە و بێ سەروبەری بەرپا نەبێ و تەندروستی و ئەخلاق و بەها ڕۆحییەکان بەسەلامەتی بمێننەوە و ناوو شۆرەت و حورمەت و مافەکانی خەڵکی بپارێزرێ، ئاشکرا کردنی هەموو جۆرە زانیارییەك کە لەسەر متمانەی خواسترابێ هەروا بەهەوەس، ناکرێ مەیسەر بێ. سەرەڕای ئەوان مەرجە دەسەڵاتی دادوەری هەر بێ لایەن بێ.

یونیسکۆ لە بیستەمین دانیشتنی خۆیدا، وەختی کۆنگرەی گشتی لە پاریس (٢٢ی نۆڤەمبەری تشرینی دووەمی ١٩٧٨) لە ڕاگەیاندن و پرنسیپە سەرەکییەکاندا، ئیقراری یاسایەکی کرد پاڵپشتی «مافی زانین» بوو:

«دەبێ دەروازەی گەیشتن بەزانیاری بۆ هەموو خەڵکی والآ و فەراهەم بێ، بۆ ئەم مەبەستەش چەندە دەروازە و سەرچاوەی زانیارییەکان زۆر بن ئەوەندە باشترە، بەم شێوەیە هەموو کەسێك دەتوانێ لە ڕاستی و دروستیی حەقیقەتی شتەکان دڵنیا بێ، مەوزووعییانەش ڕووداوەکان هەڵسەنگێنێ. بۆ گەیشتن بەم ئاکامە، ڕۆژنامەنووسەکان هەقی خۆیانە بەتەواوی سەربەستی وەرگرتن و ناردنی هەواڵ و ڕاپۆرتیان هەبێ، جگە لەوەش دەبێ هەموو زەمینەیەك خۆش بکرێ تا بگەن بە سەرچاوەکانی زانیاری.»

ڕاستییەکان کەرەستەی خاوی بەخشین و وەرگرتنی سەربەستانەی زانیارییەکانن، واتە ڕاستییەکان دەبنە بابەتی وا کە بەئاسانی و سەربەستی لە کەسێکەوە بگاتە کەسێکی دیکە، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بگوێزرێتەوە، ئەمەیان مەرجی پێشینە بۆ ئەوەی بەڕاستی حەقیقەتەکان بکەونە دەست هەموو یەکەیەکی کۆمەڵ، جگە لەوەش مەرجێکی پێویست و بەردی بناغەی هەموو حکوومەتێکە کە خۆ بە بەرپرسیار بزانێ.

گەرچی حکوومەتەکان لە سەد لاوە هێز و دەسەلآتیان هەیە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دژی ئەوەن سەربەستانە و بەئاسانی هەواڵ و زانیارییەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بگوێزرێتەوە، لە زۆر شوێنی ئەم دونیایە وای لێ هاتووە کە پاراستنی نهێنی ببێ بە بناغەی حکوومەتێکی ساغ و توند و تۆڵ.

لە زۆر ولآتدا ژمارەیەکی زۆر لە یاسا و دەستوور و دابونەریت و پەیمان و ڕێکەوتن لەسەر ئەوە کراوە کە سنوورێك بۆ چەندیەتی و چۆنیەتیی ئەو زانیارییانە دابنرێن کە پێشکەش بەجەماوەر دەکرێن، واتە سنوور بۆ سروشتی ئەو زانیارییانە و بارستایی و قەوارەیان.

ئەوانەی کە کورسییەکانی حوکمیان بەدەستە و مافی گەیشتن بە

[illegible] ئەساسییەکانیان هەیە بەشێوەیەکی بەرفراوان و سەراپاگیر ئەو [illegible]یان لەسەرە کە هەر نهێنییەك پەیوەندیی بەرەسمیاتەوە هەبێ، [illegible] بپارێزرێ. هەروەها لە ڕێگەی جەڕاندن و لە میر بەندان و لە [illegible]دانی هەواڵ و زانیارییەکان لەژێر ناوی ڕێکخستنی هەواڵەکانەوە، زۆر حەقیقەتی بنەڕەتی هەن لەناو دەچن، جگە لە فێڵی ڕێکخستنی هەواڵەکان مەسەلەی کورتکردنەوەی هەواڵەکان لەو بوارەدا بەشێك لە حەقیقەت ون دەکا، شێواندنی ڕاپۆرتی ئەو کۆبوونەوە نهێنییانەی کە قەدەغەن لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بڵاو ببنەوە. لەگەڵ هەموو شێوەکانی تری ئاڵوگۆڕی هەواڵ و حەقیقەتەکان، کە زۆر جار دیوارێك لە نێوان زانیارییەکان، جەماوەرو ڕۆژنامەنووسدا هەڵدەبەستێ و وادەکا کە جەماوەر سەبارەت بەهەقی هەڵبژاردنی مەسەلە گرنگ و ورد و چارەنووسسازەکانی سیاسەت هیچی بۆ نەکرێ و لێیانەوە بەدوور بێ.

گرفتەکە لەوەدایە لە کاتێکدا زۆربەی وڵاتان بڕوایان وایە کە «سەربەستیی چاپەمەنی» لە وڵاتەکانیانا بەر کەماڵە، بەڵام بەمانا فراوانەکەی هەرگیز نەیانتوانیوە دەربڕی ئەو بڕوایە بن. لە ڕوانگەی حکوومەتی بریتانیاوە و لە ۱۹۸۹وە یەکێتیی ڕۆژنامەنووسان وا دەڕوانێتە ئەم مەسەلەیە:

«ڕەگوڕیشەی ئەو گرفتە لەوە دەچێ لەوەدا بەرجەستە بووبێ کە وا تێ بگەن سەربەستیی چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە تا هەنووکەش بە تەنیا لە رادەربڕیندا پێناسە بکرێ، بەڵام دوور لەوەی جەماوەر هەق و مافی زانینی هەموو شتێکی هەبێ. ئەنجامەکەشی بەئاشکرا وا دەردەکەوێتەوە کە هیچ کەسێك، نە ڕۆژنامەنووسەکان، نە سیاسییەکان، نە دادوەر و نە پارێزەرەکان ئەوەندە ڕۆشنبیر نین، یان با بڵێین خۆیان لەسەر ئەوە ڕانەهێناوە کە بە زبانێکی یەکگرتوو ڕای بگەیەنین کە بایەخی یەکەم بۆ «سەربەستیی زانین» بێ.

سەربەستیی بیر و ڕا دەربڕین و هەق و مافی زانین، دەبێ ببنە یاساو دەستووری هەموو لایەك، مەسەلەی سنوور دانان بۆ سەربەستی یان هەر هەڵاوێردانێك لەگەڵ هەر بەرپرسیاربوونێك بۆ پاساو هێنانەوە و عوزر خوایی و خۆ پاك كردنەوە لەهەر هەڵەیەك بەجێ دەمێنێ بۆ ئەو كەسانەی حەز دەكەن ئەو كۆت و بەندانە بخەنە دەست و پێی پرۆسیسی سەربەستی و مەبەستیانە سنووری بۆ دابنێن. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٧دا و لە جاڕی یان ڕاگەیاندنی ڤیەننا بۆ مافی ڕۆژنامەنووسان هەست بەوە كراوە كە دەبێ هەموو لایەك ڕووبەڕووی ئەو كۆت و بەندانەی ببنەوە و سنوورەكان ببەزێنن: ئەوەبوو لە كۆنفرانسێكی دوو قۆڵیی نێوان «یەكێتی ڕۆژنامەنووسانی جیهان» و ڕ«ێكخراوی جیهانی بۆ ڕۆژنامەنووسان» كە سەبارەت بەمافە ئینسانییەكانی ڕۆژنامەنووسان بەسترابوو، ڕووبەڕووی ئەو یاسایە وەستانەوە كە بازنەی سەربەستییان تەسكتر دەكاتەوە... ئەوەبوو وتیان: سەربەستی ئاڵوگۆڕكردن و گواستنەوە و بەیەكگەیشتن لە نێوان كەسەكان و دەزگا و حكوومەتەكان كە بەردی بناغەی لە یەك تێگەیشتن و هاریكارییە، زۆر بەئاشكرا دیارە كە وەدەستهێنانی ئەو سەربەستییە لە ڕۆح و گەوهەری كۆبوونەوەكانی «هێلنسكی»دا، پێشتر وەئاگا هاتبوو.. هەر ئەوەش ڕێی خۆش كرد كە ڕۆژنامەنووسان ڕێگەیان پێ بدرێ سەربەستانە بچنە نێو هەموو وڵاتێك و گەڕان و سووڕانیان بەكەیفی خۆیان بێ و هیچ وڵاتێكیش بۆی نییە سنوورەكانی خۆی لە ڕووی ڕۆژنامەنووساندا دابخات. هەقی خۆیانە لە هەڵبژاردنی سەرچاوەكانی زانیاری و هەواڵ وەرگرتن سەربەست بن، بۆ گەیشتن بەسەرچاوەكانی زانیاری، جا چ چاپكراو و چ ئەلیكترۆنی بێ، نابێ بەهیچ كلۆجێك ڕێیان لێ بگیرێ و گەرەكە هەموو دەروازەیەكیان لێ بكرێتەوە.»

بۆ بەندی ژمارە (٢٩)ی «جاڕی گەردوونیی بۆ مافەكانی مرۆڤ»، وا

دەخوازرێ کە هەر سنوور بەندییەك و بازنە داخستنێك لەسەر بەندی ژمارە (١٩)دا، نابێ هەر لەخۆوە بڕیاری لەسەر بدرێ، لادان لە هەر بڕیارێك لەو بەندانەی مافەکانی مرۆڤ دەبێ لە ڕێگەی یاساوە بێ، واتە یاسا مەودا و سنووری ئەو سەربەستییە دەستنیشان دەکات. ئەوەش لە پێناو ئاسایش و پاراستنی هەموو لایەکە و ئیعتیراف و ڕێزلێنانە لە هەموو شێوەکانی ماف و سەربەستیی خەڵکانی دیکە، لەگەڵ داوا ڕەواکانی ئەخلاق یەك دەگرنەوە، ئامانج تێکنەچوونی ڕیزبەندیی کۆمەڵگایە، بەرگریکردنە لە خۆشی و بەرژەوەندی گشتیی خەڵك و عەوامە لە کۆمەڵگایەکی دیموکراتیدا.»

ڕێکخراوی چاودێرانی جیهانی، لە بەندی ژمارە (١٩)دا نووسیویەتی:

«حکوومەتەکان دونیایەك هۆ بۆ پاراستنی نهێنییەکان دەدۆزنەوە، ئەو هۆیانەی دەبنە پاکانە بۆ سەر قاپ نانەوە لەسەر هەموو نهێنییەك کە حکوومەتەکان حەز بەبڵاوبوونەوەی ناکەن. لە ڕاستیدا زۆربەی ئەو عوزر خوایی و هۆیانە نابەجێن بەو مانایەی کە ئەو سنوور دانان و کۆت و بەندە لەسەر نهێنییەکان دەستکردی حکوومەتەکانن و یاسایەکی جیهانی و سەراپاگیری ڕێگە پێدراوی بۆ دانەنراوە، ئەگەر بوێرین هەق بڵێین: ئەوە دیارە لەودیو ئەم سنووربەندییە و پاراستنی نهێنییەکان هەندێ نیاز و ئامانجی ناشەریف هەن: وەك خنکاندن و کپکردنی ڕۆحی ڕەخنەگرتن و بیر و باوەڕە نائاساییەکان کە ڕەنگە لەکن حکوومەتەکان بە لەڕێ لادان حیسابی بۆ بکرێ.»

بەندی ژمارە (١٩) لەسەری دەڕوا و دەڵێ:

«دەبێ گفتوگۆ لەسەر هەر سنووربەندی و کۆت و بەندێك، شیاو بێ یان هەقی ئەوە هەبێ بەرپەرچی بدرێتەوە، جا بۆئەم مەبەستە هەموو ڕێگە چارەیەکی جێبەجێکردن، بەو پەڕی سەربەخۆیی، دەبێ لە کاردا بێ، بۆ

ئەوەش پەنابردنە بەر لیژنەیەکی باڵای دادوەری و چاو خشاندنەوە بەسەر هەموو ئەو یاساو دەستوورانەی کە مەودای سەربەستیی چاپەمەنی و نهێنی پاراستن و ئاڵوگۆڕی زانیاری دەستنیشان دەکەن گەلێ ڕەوایە.»

**٤- کۆسپەکانی بەردەم «مافی زانین»:**

(ئەلف): کارتێکردنی یاسا و شەریعەتی سەربەستی زانین: گەلێ لێکۆڵینەوە و باسوخواس لەسەر ئەنجامی بڕیارەکانی «بزووتنەوەی سەربەستیی زانین» هاتنە کایەوە، لە پێداچوونەوەیەکی ڕۆبێرت هازل بەسەر ڕاپۆرتەکانی ئوستورالیا و کەنەدا و نیوزیلەندا ئەم بەرئەنجامانەی وەدەرخست:

«بزووتنەوەی سەربەستیی زانین (FOI)، تا ئێستاش نەیتوانیوە خەون و ئامانجە پڕ لە تەماعەکانی خۆی بێنێتە دی، بۆ نموونە دەبووایە جەماوەر پتر بەشداریی بڕیارە چارەنووسسازەکانی حکوومەت بکا کە نەکراوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا نەیانتوانیوە زۆربەی مەترسی و پیلانە کوشندەکانی بەرهەڵستکارانی ئەو سەربەستییە بنەبڕ بکەن.»

«هەردوو حکوومەتی نوستralیا و کەنەدا پێیان زەحمەتە نارەحەتیی خۆیان سەبارەت بەو یاسا و تەشریعاتەی کە هەیانە بشارنەوە، هێشتا سووکە گومانێك لە ئارادا هەیە کە مەبەستیان بێ یاسا و دەستووریك بۆ چاپەمەنی دابنێن کە ئامانج سنوور بەندی بێت، ڕاستی هیچ گۆڕانێکی سەرەکی سەبارەت بەسیاسەتی چاپەمەنی ڕووی نەدا، دەرچوونی یان پەرتبوونی هەواڵ و زانیارییەکان هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە.»

بەهەق «بزووتنەوەی سەربەستیی زانین»، پرۆسێسێکی هێواش و لەسەرخۆیە، بەزۆریش سەرقاڵی وەرگرتن و دانەوەی ئەو زانیارییانەیە کە بەشێوەیەکی سەرەکی هی ڕۆژانی ڕابردوون، لەپاڵ ئەوەشدا پەردە لەسەر

هەموو ئەو مەسەلە و باسوخواسانە لا دەدا کە جێی مشتومڕ و ململانێی ئەم سەردەمەی خۆمانە کە تا ئەم ساتەوەختەش ئەوە دەهێنێ وەك هەواڵ و زانیاری کەڵکیان لێ وەربگیرێ. بەڵام ئەگەر فەرمانبەرانی حکوومەت بڕیاری هەر هەواڵ دزین و هەواڵ پەرت کردنێك بدەن دەبێ لەوەدا خۆ بنوێنێ کە شێواز و تەکنیکی ئەم کارەیان لەژێر چەتری «بزووتنەوەی سەربەستیی زانین»دا بگۆڕێ، واتە لە بری تەسلیم کردنی بەڵگەنامە و دۆکیومێنتەکان لەناو زەرفی پێچراوە بە ڕۆژنامەنووسەکان، واباشترە پێشنیاری ئەوە بخەنە بەردەم ڕۆژنامەنووسەکان کە بۆیان هەیە سەبارەت بەهەر بابەتێکی دیاریکراو فایلێك بۆ ئەو داواکارییە بکەنەوە و ئەو دۆسییە ببێ بەسەرچاوە بۆ وەرگرتنی هەر زانیارییەکی تازە.

هەروەها پێداچوونەوەی «هازل» دوو ڕووی زەقی یاسایی، «بزووتنەوەی سەربەستیی زانین» دەردەخات. ویستی سیاسی هەر حوکمەتێك بەشێوەیەکی بنەبڕ و بەشێنەیی ڕێ بۆ ئەوە خۆش دەکات کە بڕیاری تایبەت بە «بزووتنەوەی سەربەستیی زانین» دەربکات و وەك دەستوور لەسەری بڕوات. گەرچی زۆربەی حکوومەتەکان لەڕووی مەبدەئییەوە دژ بەو یاسا و دەستوورە کاریان کردووە، ئەویش لەو ڕێگەیەوە کە هەوڵیان داوە هەندێ کۆتوبەندی شەرعی و عەمەلی بخەنە سەر هەموو هەواڵێك و کۆسپ بخەنە بەردەم گەیشتن بەدەروازەکانی زانیاری و بازنەی ئەو مافە بەر تەسکتر بکەنەوە.

بەهەر حاڵ، لەگەڵ ئەو هەموو کەموکورتییانەشدا تەشریعاتی بزووتنەوەی سەربەستیی زانین(FOI-) بەگشتی بووەتە چاکترین میکانیزم بۆ هەر مەسئوولیەت و هەنگاو هەڵێنانێکی دیموکراتی، لەپاڵ کۆمیتەکانی نێو پەرلەمان کە هەمیشە لە گەڕان و سۆراخدان بەدوای سەلماندنی هەقیقەتەکان، لەپاڵ هەوڵی هەموو دادگا و دادوەر و چاودێران و گوێگران ئەم بزووتنەوەیە لەو هەوڵەدایە کە سیستمی چێك

کردن و هاوسەنگی لە نێوان بەخشین و وەرگرتندا، لە نێو ڕێگە گرتن و ڕێگەداندا، لە نێوان ئەرك و فەرماندا، لە نێوان سەربەستی و بەرەلاییدا بخولقێنێ کە ئەوەشیان بۆ یەکێتیی دەسەلاتە گشتی و کۆمەلایەتییەکان تا بڵێی پێویستە.

بێ: نهێنییە تایبەتی و کەسییەکان، کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە هاوسەنگیی ڕاست و دروست لە نێوان مافی زانین بۆ جەماوەر و ئیلتیزامی دەوڵەت لە پاراستنی ژیانی تایبەتی خەڵکی بدۆزێتەوە، کارێکی زەحمەتە هەردوو تای تەرازووەکە یەکسان بوەستن، لەلایەکەوە مافی تەواوی جەماوەر ئەوەیە هەموو هەقیقەتەکان بزانێ، لەلایەکی دیکەشەوە دەوڵەت بەڵێنی داوە کە هەر شتێك پەیوەندیی بەژیانی تایبەتمەندیی تاکەکانەوە هەبێ، مەرجە بپارێزرێ.

بەلام مەسەلەی ئەم هاوسەنگیی و تەرازووە بەشێوەیەکی بەرفراوان لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر جیاوازە. هەر بۆ نموونە لە نیویۆرکدا پەیامنێری «نیوزدەی» توانیی بەنێو هەموو ئەو دەفتەری حساباتانەی شاردا بگەڕێ و لێیان ورد بێتەوە و دوای ئەوەش ناوی هەموو ئەو کەسانەشی بلاوکردەوە کە حکوومەت یان کەسانی لێپرسراو باجی پتری لێ سەندوون، زۆرتر لەوەی کە دەستنیشان کراوە، ئەم جۆرە پشکنین و خۆ تێ هەڵقورتاندنە لە حیساباتی تاکەکانی کۆمەڵ، لە زۆر ولاتی دونیا ناشەرعی و مەحاڵە و ڕێگەی پێ نادرێ.

هەندێ دەسەلاتدارانی دەوڵەتان مشتومڕیان لەسەر ئەوەیە کە سەربەستیی گەیشتن بەهەموو سەرچاوەکانی زانیاری و دەرگا خستنە سەر پشت وای کردووە دز و جەردە و پیاو خراپ و پیاو کوژان بۆ هەندێ مەبەست و نیازی پیس کەڵك لەو سەربەستییە وەربگرن. «دۆریس گرەیبەر» لە لاپەڕە ١٢٥دا نووسیویەتی:

«یاسای سەربەستیی زانین لە ئەمریکا لە لایەن کۆمەڵێ هەڵقەی تاوانباران و دەست پیس و بازرگانانی تلیاك کەڵکی لێ وەرگیرا بۆ ئەوەی چالاکیی خۆیان بەرفراوان بکەن و لە ڕێگەی دەستگیربوونی نهێنییەکان دەیانتوانی هەڕەشە لەم و لەو بکەن و دەنێو کۆمپانیا بازرگانییەکان سیخوڕیان بەکرێ دەگرت تا ئەمیان بەچالاکی ئەوی دیکەیان بزانێ ئەو پیاو خراپانە دەبوونە چاوی کۆمپانیاکان. بگرە پیاوکوژەکانیش کەڵکیان لەو سەربەستیی زانینە وەرگرت: لە ۱۹۸۹ ویلایەتی کالیفۆرنیا بڕیارێکی دەرکرد کە بەشێوەیەکی گشتی گەیشتن بەزانیاریی نێو فایلی کەسە ناودارەکان قەدەغە بکرێ، شوێنی دانیشتن و نیشتەجێ بوونی کەسانی بەناوبانگ لە هەندێ دەزگادا تۆمارکراون ترسی ئەوەی هەیە ئەم زانیاریانە پەرت بێ و بگاتە دەستی نیاز پیسان بۆ نموونە: بەڕێوەبەرایەتیی هاتوچۆ زانیارییەکی زۆری تۆمار کردووە کە ناکرێ هەموو کەس بیزانێ، بەتایبەتی لە هشتەی مۆڵەتی لێخوڕینی ئوتومبێل ئەم یاسای شاردنەوە و نهێنی پاراستنی شوێنی نیشتەجێ بوونە ئەو کاتە دەرچوو کە ڕێبیکا شایفیر، ژنە ئەکتەری ناودار بەدەستی یەکێ لە شەیدا شێتەکانی خۆی کوژرا، ناوونیشانی ئەو ژنە ئەکتەرەشی لە کۆمپانیایەکی تایبەت بەکاروباری خەڵکی وەرگرتبوو.

هەنووکە هەر کەسێك زانیاری لەم بابەتانە بەهەر ڕۆژنامەنووسێك بدات، یان مافی یاسایی وەدەستهێنانی ئەو زانیارییانەی نەبێ: ئەوە دەبێ سزاکەی پێنج هەزار دۆلار بێ یان ئەوەتا بۆماوەی ساڵێك یان دووان بەند بکرێن.

تێ: سەرچاوەکان، بارستاییی ئەو زانیارییانەی کە لە خەڵك و عەوام دەست بکەوێ، ڕەنگە لەبەردەم گەیشتن بەدەروازەیەکی پڕ لە متمانە ڕێگر بێ، مەسەلەکە زۆر و بۆر و سەر لێشێوانە، گەرانیش بەنێو شتە تۆمارکراوەکانی حکوومەت وەختێکی زۆر دەکوژێ و بگرە

بەمەسرەفیشە، ڕاستی دەبێ ڕۆژنامەنووسەکان و هەموو کەناڵەکانی بڵاوکردنەوە تا ئەوپەڕی خۆ هیلاك بکەن و هەموو هەواڵ و بوارێك کە یاسا بۆی ڕەخساندبن مەرجە کەڵکی لێ وەربگرن.

بەم شێوەیە لە هەندێ لەو وڵاتانەی کە بڕیارەکانی سەربەستیی زانین و زانیاری تیا دەرچووە، بەتایبەتی لە ئەمریکا، هەندێ لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن چەند سیستەم و یەکەیەکی لێکۆڵینەوە و هەواڵیان دامەزراندووە کە تیایدا کۆمپیوتەر سەرجەم کارەکانی بڵاوکردنەوە ئاسان دەکا. ئەو کۆسپ و تەگەرانەی کە لە بەردەم کۆکردنەوەی زانیارییە بە بایەخ و گەوهەرییەکان قوت دەبنەوە لەو حاڵەت و شوێنانە زۆر و گەورەن کە پەیوەندیی توند و تۆڵیان بە ژیان و گوزەرانی زۆربەی خەڵکەوە هەیە. بۆ نموونە کۆسپ لەبەردەم کۆکردنەوەی ئەو زانیاریانە زۆر دەبێ کە بە ژینگە و دەوروبەرەوە پەیوەستن.

بەگوێرەی بەندی (١٩) هەندێ جار بەناوی پاراستنی ئاسایشی نەتەوە و ڕۆتینی دەزگاکان و ڕەوتی بیروقراتیی حکوومەتەکان گرێ و کۆسپی زۆر دەخەنە سەر ڕێی ئەوانەی هەندێ زانیاری و داتا یان زانستیان سەبارەت بە ژینگە و دەوروبەر دەوێ یان سەبارەت بەمەرجەکانی ژیانداری.

هەر لەم بوارەدا بەندی ژمارە (١٩) لەسەری دەڕوا و دەڵێ: «زانیاری سەبارەت بەپیس بوونی ژینگە بەشێوەیەکی ڕۆتینی ئامانجی سانسۆر و چاودێری کردنە، تا شۆڕشەکانی ١٩٨٩ی ئەورووپای ڕۆژهەڵات مەودا و ئاستی پیس بوون و وێرانکردنی ژینگە و سروشت لە چاوانی سانسۆر شاردرابوونەوە.

بەندی ژمارە (١٩)، نموونەیەکی دیکەی هێناوەتەوە کە لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا – UNدا بەئاشکرا وای دەنوێنێ کە مەسەلەکە پەردەپۆشی

یاساکانی بڵاوکردنەوەی هەقیقەت و نهێنییەکان پەیوەندیی بەئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە کە بەتەواوی دیارە ناشەرعی و نابەجێیە. لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٨دا فایلەکانی ساڵی ١٩٥٧یان هەڵدایەوە و ئەو یاسایەیان شکاند کە پتر لە ٣٠ ساڵ نهێنییەکانی پەردەپۆش کردبوو، ئەوەبوو ئاشکرایان کرد کە سەرۆکی وەزیرانی ئەوسا هەرۆلد ماکمیلان فەرمانی دەرکردبوو کە هەموو زانیارییەك سەبارەت بەکارەساتی دامەزراوێکی ئەتۆمی لە-وندز کەیل- لە هەموو خەڵکی بشارنەوە، دەرچوو، هێزی تێکشکاندنەوەی ئەتۆمی لەو دامەزراوە ٦٠٠ جار لەوەی دوورگەی ٣ میل لە ئەمریکا زیاتر بووە.

زۆر جاران زانیاری سەبارەت بەتەندروستیی خەڵکی لە دانیشتووان خۆیان دەشارێتەوە، گەرچی هەندێ جار زۆریش بکەوێ لەسەر ژیانی خەڵکی و ئەنجامی ترسناکیشی هەبێ. تەشریعاتی وڵاتی بەریتانیا نموونەیەکی زەقی ئەم حاڵەتەیە. بەگوێرەی بۆچوونێکی «هارۆلد ئیفانس»، سەرنووسەری پێشووتری سەندەی تایمس.

«بەشی بیست و شەشەم لە بڕیارێك سەبارەت بە -پاك پاراستنی ژینگە- وای ڕاگەیاندووە کە لە بواری پیس بوونی ئاو و هەوا و خاکدا تاوانە گەر پەردە لەسەر لەڕێ لادانێك هەڵدەیتەوە، وەك بڵێی تاوانە گەر تاوانێك ئاشکرا بکەی.»

بۆ نموونە: سەفەرێکیان خاوەنەکانی کارگەیەك بە ١٠٠ سەد پاوەن سزا دران؛ چونکە پاشماوەی کارگەکەیان کە سیانید بوو دەڕژاندەوە نێو ڕووبارێك، بەڵام ئەو پشکنەرەی ئەم هەواڵەی بڵاوکردەوە خەڵکی لێ هان دا بە سێ مانگ بەندیخانە حوکمی بەسەردا دابڕا. «کتێبی میدیا و سیاسەتی دەرەکی» لاپەڕە-١٩٧ لە ساڵی ١٩٨٧دا ڕاپۆرتی «برووند لاندت» لەسەر «ئایندەی هاوبەشمان» بۆ گەشەسەندنێکی درێژ خایەن

مەرجێکی پێشینە و بنەڕەتیی داناوە. ئەویش «بوونی سیستەمێکی سیاسیی ئەوتۆ کە بەراستی بوار لە بەردەم هەموو کەسێکدا خۆش بکات کە بەشداریی کاریگەری بڕیارە چارەنووسسازەکانی بکات».

بەشداریی کاریگەر و چاکیش پێویستی بەوە هەیە کە «خەڵکی ئاگای لە ورد و درشتی ژیانی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی بێ».

جیم: نهێنی نەدرکاندن، وەك پێناس کراوە گەورەتری بزووتنەوەی سەربەستی زانینە. گەرچی ڕێکخراوەکانی ڕۆژنامەنووسان و ئازادیی خوازانی مەدەنی، وای بۆ دەچن کە نهێنییە ڕاستەقینە و ترسناکەکان ئەوانەن «کە درکاندن و بڵاوکردنەوەیان بۆ وڵات زەرەری هەبێ پتر لەوەی کە وەزیرەکان پێ سەغڵەت بن». لە کتێبی «سەرچاوە نزیکەکان بەسەرەك وەزیران» و لە لاپەڕە ٢٣٨دا، جەخت لەسەر نهێنی پاراستن دەکا، لە زۆربەی وڵاتەکانیش پێ لەسەر پتر و پتری نهێنی شاردنەوە دادەگیرێ.

وەك لە بەندی ١٩دا تێبینی دەکرێ:- بۆ سنوور دانان و زاڵبوون بەسەر بەخشینی ئەو زانیاریانەی کە دەدرێن بە ڕۆژنامەنووس و توێژەرەوەکان، ئەوانەی کە بۆ ئەو هەواڵ و زانیارییانە ڕوو لە سەرچاوە گشتیی و تایبەتییەکان دەکەن، گەلێ شێوازی جۆراوجۆر پەیڕەو دەکرێن:

١- کۆنترۆڵ کردنی ئەو بابەتانەی کە ڕەسمین و ئامادە کراون بۆ بڵاوکردنەوە و جگە لە هەق پێدان بە کورتکردنەوەی بابەتەکان. (بۆ نموونە بۆ ئەوەش سیستمی یانەی چاپەمەنییەکان پێی هەڵدەستن).

٢- پۆلێنکردن یان سەر لەنوێ ڕێکخستن و پۆلینکردنی ئەو زانیارییانە. حسێبی نهێنییان بۆ دەکرێ. بۆ نموونە لە ئەمریکا لە ئەنجامی زۆربوونی زانیارییە بنەڕەتییەکان خشتە و خانەی تازە بۆ زانیارییە بەبایەخ و سەنگینەکان لە ساڵی ١٩٨٦دا دامەزرا. لەوەدا هەموو

زانیارییە بێ سەر و بەر و ناجێگیرەکان لە ڕێگەی پۆلینکردن، گۆڕا بەزانیارییەکی جێگیر و حسێب بۆ کراو.

٢- ئاسان و ڕازیبوونی فەرمانبەرە حکوومییەکان بەئەرکی پاراستنی نهێنی کە بەڵێنیان داوە بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ، هەندێ جاریش تا هەتا هەتایە، جێی متمانە پێکردنە بەڵێنێکە کە لە فەرمانبەرە حکوومییەکان وەرگیراوە، هەندێ جاریش فەرمانبەرانی کەرتی تایبەتیش ئەم بەڵێنە دەدەن. مەسەلەی خۆ بەستنەوە بەرەت نەکردنی زانیاری بۆ ئەو کەسانەی کە ئەو ڕوخسەتەیان پێ نەدراوە پەیوەندیدارە بەهەموو زانیارییەك کە لە میانەی ڕێککەوتنەکان سەبارەت بەمەسەلە سیاسییەکان وەدەست هاتوون، نەك هەر سیاسەت بەڵکو هەموو چالاکی و پیلان و متمانەی دارایی و داهێنان و ئەو پەیمانانەی هێشتا لە گەرمەی گفتوگۆدان و گشت فایلە تایبەتی و مەسەلە حسێبییەکان. هۆیەکان بۆ پەیمانی پاراستنی نهێنی بە پێی ئەو لایەنانەی کە بەشدارن دەگۆڕێ، فەرمانبەرە حکوومییەکان بەوە بەستراونەتەوە کە لە پێناو ئاسایشی نەتەوەییدا دەبێ نهێنی پارێز بن، جگە لەوەش زۆر پێویستە خەڵکی متمانەیان پێ بکات کە هەموو فایل و دۆسیە و کاغەزە تایبەتییەکان دەپارێزرێن و هیچ نهێنییەکیان ناچێتە دەر. هەندێ جار خۆ بەستنەوە بەپاراستنی نهێنییەکان لە مۆڵەت و ماوەی ئەو پەیمانەش زیاتر دەبێ کە لەسەری ڕێك کەوتوون.

لە ساڵی ١٩٨٣وە لە ئەمریکا فەرمانبەرە حکوومییەکان بەسەریاندا سەپاوە کە پەیمانێکی سەرتاسەری مۆر بکەن کە هیچ زانیارییەکی پۆلێنکراویان یان شیاوی پۆلێنیان نابێ دەربچێ و ئاشکرا کردنی مەحاڵە، ئەم جۆرە ڕێککەوتننامانە لە کانونی یەکەمی -١٩٨٩-دا سێ ملیۆن و نیو کەس مۆریان کرد، ئەوەش مانای داخستنی ئەو ملیۆنەها کەسە بوو، بەم پێیە بەشێوەیەکی زۆر دڵڕەقانە بوار لە بەردەم هەموو

جەمار و ئەندامانی لیژنەکان و بگرە کۆنگرێسیش نەمێنێ و بەزەحمەت دەستیان بگاتە سەرچاوە زانیارییە زۆر پێویست و زیندووەکان، جگە لە کەمکردنەوەی چاودێریی کۆنگرێس (بەندی ژمارە -١٩٩-) پیشەسازی کەرتە تایبەتییەکانیش هەمان ڕێڕەویان گرتە بەر بەوەی، وایان کرد کارمەندان و کرێکارانیان بەڵێنی پاراستنی هەموو نهێنییەك مۆر بکەن لە ١٩٨٨ و ١٩٨٩دا ئەم جۆرە بەڵێن و ڕێککەوتنانە بەڕەسمی لەلایەن (١.٤٥٥،٣٤٠) کرێکاری کەرتی تایبەتەوە مۆرکرا، لە ڕووی مەبدەئییەوە بۆ پاراستنی پیشەسازی بوو. مەسەلەی بەڵێنی پاراستنی نهێنییەکان کاریان کردە سەر کۆنگرێسی ئەمریکیش: ستافی -ئێران کۆنترا- لەگەڵ دەستەی چاودێرەکانی کۆنگرێس لەم چەشنە بەڵێنانەیان بۆ نێو دەستەی جێبەجێ کردن کە پتر نهێنی هەڵگر بێ. (پێداچوونەوەی ڕۆژنامەگەریی کۆڵۆمبیا- نۆڤێمبەر و دیسێمبەری ١٩٩١، لاپەڕە ٢٢).

پێویستیی پەیداکردنی متمانە و پاراستنی نهێنی لە هەندێ حاڵەتدا، دژ بەو حاڵەتە دەوەستێتەوە کە پێی دەوترێ بەرژەوەندیی جەماوەر. ئەم حاڵەتانە بابەتی سەرەکیی هەراکانی دەستگیرکردنی سیخوڕەکان بوو لە ساڵی ١٩٨٥دا چ لە ئوسترالیا و چ لە بەریتانیا. دادگاکانی هەردوو وڵات گەیشتنە ئەو حەقیقەتەی کە لە هەندێ حاڵەتدا بەرژەوەندیی گشتی لە مەسەلەی پەردە لادان لەسەر تاوانەکان دەکەوێتە پێش ئەرکی پاراستنی نهێنییەکان. بەڵام هەر لە ساڵی ١٩٨٩وە لە بەریتانیا بڕیارێك دەرچوو لەژێر ناوی «بڕیاری نهێنییە ڕەسمییەکان» هیچ هەقێکی نەدا بەفەرمانبەرە حکومییەکان بەبیانووی بەرگری لە بەرژەوەندی گشتییەوە زانیاریی پۆلێنکراو بۆ دەرەوە ڕەت بکەن.

١- ڕاگرتنی ڤیزا یان زەحمەتکردنی سەفەر لە نێوان وڵاتان یان هەتا لەنێوان شارەکانی وڵاتێکدا.

٢- زەحمەتكردنی یان نەهێشتنی گەیشتن بە سەرچاوە ڕەسمی یان سەربەخۆكان. كۆسپ خستنە بەردەم هەر هاریكارییەك لەگەڵ هەر سەرچاوەیەك هەتا گەر ناوخۆییش بێ.

٣- بەخشینی زانیاری تەنیا بەوەكالەتە، گەورە و نووسینگە سەرەكییەكانی هەواڵ، دەسەڵاتە حكوومییەكان زۆربەی وەخت وای دەنوێنن كە «بزووتنەوەی سەربەستی زانین» تەئسیرێكی نێگەتیڤیی هەیە لەسەر بڵاوكردنەوە و پەردە لادان لەسەر نهێنییەكانی دەوڵەت، لەم بۆچوونەشدا جۆرێك لە زێدەڕۆیی لە ئارادا هەیە. شیكردنەوەیەكی بەراورد كارانەی ئەو یاسایانەی بۆ «بزووتنەوەی سەربەستیی زانین FOI-» دانراون لە ئوسترالیا و كەنەدا و نیوزیلەندا گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتەی كە ئەو تەشریعاتەی لەو وڵاتانەدا هەن توانیویانە سەركەوتووانە نهێنییەكانی حكوومەت بپارێزن. (بەڕێوەبردنی حكوومەت -ڕۆبێرت هازل، ڤۆلیوم (٦٧)، هاوینی (١٩٨٩) -لاپەڕە ١٨٩-٢١٠) لە زۆربەی حاڵەتدا ئەوەی كە گرەوی لەسەر بووە، نهێنییەكانی حكوومەت نەبوون، بەڵكو پەیوەندیی بەقازانجی ڕامیاریی و ئابوورییەوە هەبووە، زانیارییە شاراوە قەدەغەكراوەكان لە نیوزیلەندا، لە ژێر حوكمی «مالدون»دا نهێنییەكانی بێ كاریشی دەگرتەوە، لەپاڵ ڕاپۆرتی هەڵسەنگاندن سەبارەت بە كۆمپیوتەرەكانی قوتابخانەكان (كە پۆستی كۆمەڵەی مامۆستایانی سەرەتایی) گرتبوویانە ئەستۆی خۆیان تا دەگاتە كرێنی پلاكی دیوار بۆ پۆستەخانە. ژمارەیەك لەو بەندانە دوای گۆڕانی حكوومەت لە ساڵی ١٩٨٤ سەربەست كران.

ئەو تێبینییانەی كە زووتر خرانە بەرچاو ئەوە پیشان دەدەن كە نهێنی شاردنەوە، نەك هەر دژ بە هەقی زانینی یەكەكانی نێو كۆمەڵ دەوەستێ، بەڵكو دژ بە بەرژەوەندیی گشتیشە. زۆربەی چاودێران گەیشتوونەتە ئەو

قەناعەتە کە هیچ نهێنییەکی دەوڵەتی بەهۆی تەشریعاتی «بزووتنەوەی سەربەستیی زانین -FOI» ئاشکرا نەکراوە، ئەوان زیاتر لەسەری دەڕۆن و دەڵـێن لـە هــەر شوێنـێکـا سیـاسەت لـە چـاوانـی جـەمـاوەر و خـەڵـکی بشاردرێتەوە و پەردەپۆش بکرێ، ئەوە مانای وایە دەیانەوێ عەبایەك بەسەر نوشوستی و کەم و کوڕی و ئاڵۆزی باری ڕامیارییدا بدەن.

پرسیارێکی واش دێتە ئاراوە:

کێ دەڵێ، باشتر نەدەبوو گەر هەندێ مەسەلەی سیاسی هەڵایساو نەورووژێنرێ بەڵکو قوڕ و قەپیان لێ بگرایە. کێ دەڵێ باشتر نەدەبوو گەر مەسەلەی داگیرکردنی دوورگەی بەرازەکان، لاوس و کەمبودیا، ڕێگرتن لە ڕۆدیسیـا کـە نـەوت بفـرۆشێ، فـرۆشتنی چەك بـەئێران نـەبووایـەتـە جێی ململانێ و لێوردبوونەوە و قسە لێکردن و تەتەڵە کردن؟

بەڵام «جەستس گێرفن» دەڵێ «ئاسایش لەودیو دیواری قەڵا و لە نێو سەنگـەر و پشت شووراکـان بـەر کـەمـاڵ نـابـێ، ئـاسایش لـە بـەهـاکـانـی کۆمـەڵگـایـەکی سەربـەستدا بـەرجـەستـە دەبـێ. وەك ئـەندامێکی کۆنگرێس (لێس ئاسپن) ئەم سەرنجەی تۆمار کردووە:

«هـەموو حکوومـەتێك دەیەوێ بەهـەردوو دیودا ئیش بکات، لەلایەکەوە مەبەستیەتی نهێنییەکانی خۆی بپارێزێ، لەلایەکەوە ئاشکرایان بکات، هەر کاتێ بزانێ کە خزمەتی سیاسەت و ستراتیژییەتی ئەو دەکا».

دال: پاراستنی سەرچاوەکان، خۆ بەستنەوە و ئیلتیزام کردن بەئاشکرا کردنی سەرچاوەکانی زانیاری بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ڕێگە گرتنە لە گەیشتن بەدەروازەکانی زانیاری. متمانە پێکردن و نهێنی گرتن بۆ لێکۆڵینەوە و گەڕان و پشکنینی ڕۆژنامەنووسان خاڵێکی بنەڕەتییە. زۆرجار سەرچاوەکان تەنیا ئەو کاتە زانیاری دەبەخشن کە بزانن و دڵنیابن ناناسرێنەوە. وەختێ ڕۆژنامەنووسان دەیانەوێ لێکۆڵینەوە و

نووسینەکانیان بۆ بڵاوکردنەوە ئامادە بکەن، ڕێیان لێ دەگیرێ، ئەگەر دادگا یان هەر دەسەڵاتێکی تەشریعی هەقی ئەوەی هەبێ ناوونیشانی سەرچاوەی زانیارییەکان بزانن، یان لەو زانیارییانە ورد بێتەوە کە هێشتا بڵاو نەبوونەتەوە، ئەو دەسەڵاتە دەتوانێ فەرمانیان بۆ دەربکا لەبەردەم دادگادا ئامادە بن تا سزا بدرێن، وەختی سەرپێچی. ئەگەر راپۆرتنووس و پەیامنێرەکان ئەم جۆرە زانیارییانە بڵاو بکەنەوە، ئەوە سوێند و شەرەفی ڕێککەوتننامەکان دەشکێنن. ئەم سەرچاوانە وایان لێ دێ نەمێنن. جا چ فەرمانبەری دەوڵەت بن یان ئەوانەی زانیاری بەمتمانەوە ڕەت دەکەن یان هەواڵدەری نێو دونیای دز و چەتەکان بن.

ئەم بابەتە بەشێوەیەکی بەرفراوان لە ساڵی ١٩٨٨دا لەلایەن یونیسکۆ و «یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی جیهانی»یەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا، ئەم لێکۆڵینەوەیە لەلایەن «پاترشیا ویلهێلم»ەوە ئامادە کرابوو کە تیایدا بەم ئەنجامە گەیشت:

«پەیوەندیی ڕاستەوخۆی نێوان ئەو سەرچاوانەی کە بەزۆری بەڕۆژنامەنووسان ئاشکرا دەکرێن لەگەڵ نەمانی ئەو سەرچاوانە یا هەر سەرچاوەیەکی دیکە کە توانایان هەیە زانیاریی ببەخشن پەیوەندییەکی ئاشکرا و ڕوونە، واتا سەرچاوەکانی زانیاریی لەترسی ناوهێنان و ئاشکرا بوونیان دەرگای بەڕووی ڕۆژنامەنووسەکان دادەخەن جەماوەر زۆر زەرەر دەکەن، وەختێ زانیارییان لێ دەشاردرێتەوە، بەبیانووی ئەوەی کە زەحمەتە متمانە بەسەرچاوەکانی ئەم جۆرە زانیارییانە بکرێ».

«بەپێی پیشە دەبێ ڕۆژنامەنووسان زۆر جاران لەگەڵ دادگا و دەزگا قەزائییەکان ڕووبەڕووی یەك ببنەوە و بەیەکەوەش هەڵکەن، بەڵام ڕۆژنامەنووسان ئەفسەری پۆلیس نین. ئەوانە نە ئەو دەسەڵاتەیان هەیە،

نەداواشیان لێ دەکرێ ئەرکی ئەفسەرانی پۆلیس بگرنە ئەستۆ، بەڵام کە تاوانێکی گەورە ڕوو دەدا، لەوانەیە زۆر لە ڕۆژنامەنووسان یارمەتیی پۆلیس بدەن بۆ پەردە هەڵماڵین لەسەر تاوانەکە و جێبەجێکەرانی.

لەو حاڵەتانەی کە ڕۆژنامەنووسان زانیاریی وا بڵاو دەکەنەوە کە هەندێ کەس و لایەنە دەسەڵاتدارەکان پێی سەخڵەت دەبن، ئەو زانیارییە ناشیرن و ناخۆشانەی وا دەکا ناو لە ڕۆژنامەنووس بنرێ «دزەکانی دۆکیومێنتە نهێنییەکان»، ئەم جۆرە ڕوانینە بەوە ڕازی نییە ئاگای لە هیچ بێ. هەمان ڕوانینە کە بڕوای وایە سزای ئەو ڕۆژنامەنووسانە بدرێ کە ڕازی نین ناوی ئەو سەرچاوانە ئاشکرا بکەن.

لە هەندێ حاڵەتی نارەسمیدا کە مەسەلەیەکی قورس لە ئارا دابێ، ڕەنگە زۆر زانیاری کە هی ئەوەیە خەڵکی بیزانێ، پەردەپۆش دەکرێ. لە بەریتانیادا، هەر بۆ نموونە، ڕۆژنامەنووسان تا چواردە ساڵ بەندیتییان بەسەردا دەسەپێ، ئەگەر «بڕیاری نهێنی پاراستنی ڕەسمی» بشکێنن. گەرچی تۆمار کردنی دەعوا لەژێر سێبەری ئەم بڕیارەدا زۆر دەگمەنە، کاتێ ڕۆژنامەنووسان، پەیمان دەشکێنن و نهێنی و ناوی سەرچاوەکان دەدرکێنن، دوو بەرەنجام لە بەردەمیانە: یان ئەوەتا فەرامۆش دەکرێن، یان ئەوەتا دادگایی دەکرێن و خۆ لە بەندیخانە دەبیننەوە. لە ساڵی ١٩٩٠دا یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی جیهانی، پتر پێی لەسەر ئەوە داگرت کە دەبێ ڕۆژنامەنووسان ناوی ئەو سەرچاوانە بدرکێنن کە جێی متمانەیانە، بەتایبەتی لە بەلجیکا، دانیمارك و بەریتانیادا.

لە ئەمریکا وەك لە بەندی (١٩)دا نووسراوە، بەشی داد، لە مانگی ئابی ١٩٨٩وە ڕای گەیاندووە کە هەر فەرمانبەرێك زانیاریی پۆلێنکراو بدا بەڕۆژنامەنووسان دەبێ بخرێتە بەردەمی دادگا و بەتۆمەتی دزینی سامان و موڵکی دەوڵەت دادگایی بکرێ. هەرچەندە ئائیبی گشتی بەپەلە

هەواڵدەران و ڕاپۆرتنووسانی دڵنیا کردەوە کە نەترسن لەوەی بخرێنە بەردەمی دادگا. «سزای قورس دژ بەو سەرچاوانە و ئاگادار کردنەوەی ئەو ڕۆژنامەنووسانە بەوەی کە دەخرێنە بەردەمی دادگا کە ناوی ئەو سەرچاوانە بەرن، تەئسیرێکی زۆر کوشندەی کردە سەر پرۆسێسی سەربەستیی بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن».

لە هەندێ ولایەتی ئەمریکیدا یاسایەکی وا دەرچوو کە ڕۆژنامەنووسان لە شەهادەتی بەزۆر سەپێنراو بپارێزن. ئەم جۆرە یاسایە چەپەرێکە کە زۆربەی ئەو هەقانە دەدا بە پارێزەران و پزیشکان و قەشەکانیش. هەقی ئەوەی ناوونیشانی سەرچاوەکانی زانیاری بشارنەوە. یاسای واش دەرچووە کە هەموو جۆرە گەڕانێك لە نووسینگەکانی هەواڵ قەدەغە دەکا کە نیاز لەو گەڕانە پەردە هەڵماڵین بێ لەسەر تاوانێك.

«بڕیاری پاراستنی نهێنی»، ساڵی ١٩٨٠ ڕێ لە هەموو جۆرەکانی دەسەڵاتی دەوڵەتی دەگرێ، لەسەر هەموو ئاستەکاندا، بۆ پشکنینی هەموو کون و قوژبنێك بەنیازی دۆزینەوەی هەواڵ و سەیر و سەمەرە، تەنیا لە هەندێ حاڵەتی تایبەتیدا نەبێ، دەنا واز لەو حەلاڵ و حەرامە ناهێنێ. گفتوگۆ و ململانێ لەسەر سرووت و مەودای بڕکردنی ئەو یاسایە، جێی مشتومڕێکی زۆرە. هەتا لە نێو ڕۆژنامەنووساندا هەر بەردەوامە.

## فیدراسیۆنی جیهانیی ڕۆژنامەنووسان:

لە ساڵی ١٩٥٤دا و لە جاڕی پرنسیپەکانی کارکردنی ڕۆژنامەنووسان ڕای گەیاند کە دیارە لە ١٩٨٦دا دەستکاری کرایەوە:

«(٦) ڕۆژنامەنووس لەسەریەتی کە حسێبی نهێنیی پیشە ڕابگرێ، ئەوەی کە پەیوەندیی بەسەرچاوەی زانیارییەوە هەیە کە لەسەر متمانە دەستگیری بووە».

هەڵبەتە متمانە و بڕوا پێ کردنەکەش، سەرچاوەکە دەیسەپێنێ،

مەسەلەی پاراستنەکە هەر بەتەنیا بۆ ڕۆژنامەنووسان نییە، بەڵکو بۆ سەرچاوەکە و هەقی زانینی بۆ جەماوەر، ئەو زانیارییەی سەرچاوەکە بەدزییەوە پەردەی لەسەر هەڵداوەتەوە. بەم شێوەیە یاساکە داوا لە ڕۆژنامەنووس دەکا کە ئەو متمانە و بڕوایە بپارێزێ، گەرچی زۆریشیان لەسەر بکەوێ، کە ڕەنگە بگاتە ڕەتکردنەوەی هەندێ داواکاریی دەزگاکانی بڵاوکردنەوە و ئەو سەرنووسەرانەی کە لە ڕۆژنامەنووسەکان بەرپرسیارن، سەرەڕای ملدان بۆ دادوەر و قازییەکان، ئەوانەی کە ڕەنگە زۆر لە ڕۆژنامەنووسەکان بکەن، پەیمان بشکێنن.

حێ: تایبەتمەندیی، یاسای سەربەستیی زانین بەتەنیا ئەو چالاکییانە دەگرێتەوە کە بەشێوەیەکی ئاسایی لەلایەن حکوومەتەوە باربوو دەکرێن. بەڵام زۆربەی ئەو زانیارییانەی کە پەیوەندییان بە خەڵکەوە هەیە لەلایەن دەزگا بازرگانییەکانەوە (کەرتی تایبەت) دەپارێزرێن.

یاسا دانەران زۆر خاو و خلیچك بوون سەبارەت بە دانپێنان بەهەقی زانین بۆ کۆمپانیا تایبەتییەکان، هەرچەندە چالاکییەکانی ئەم جۆرە کۆمپانیایانە بەقەد دەزگا و دەسەڵاتە جیاکانی حکوومەت کاریگەرییان لەسەر ژیان و خۆشگوزەرانیی خەڵکی هەیە.

مەسەلەی هەقی زانین و نەزانین ئەو کاتە پتر زەق دەبێتەوە کە مەودای تایبەتمەندیی نهێنییەکان، سنووری دیاری بکرێ، یان چالاکییەکان کە حکوومەت باربووی دەکات بچێتە نێو چنگی کۆمپانیا تایبەتییەکان. لە زۆربەی وڵاتان ئەم یاسایانەی کە هەن بۆ ئەوەیە کە سنوور بۆ کار و ئەرکەکانی وەکیل و بەڕێوەبەری کۆمپانیاکان و دەزگا بازرگانییەکان دابنێن. لە هەندێ وڵاتیشدا داوا لە کۆمپانیاکان دەکرێ کە زانیاریی ڕاست و دروست بەو کەسانە بدەن کە کۆمپانیاکان بەشیان هەیە، بەهەموو بۆرسەکان، بۆ دادگاکان و زۆربەی ناوەندە حکوومەتییەکان.

مەبدەئی پەردە لادان لەسەر مەسەلە ماددییەکان کە پەیوەندی بەقازانجی گشتیی خەڵکەوە هەبێ، حیسابی بۆ کراوە و دانی پیانراوە، بۆ نموونە: خستنە ڕووی ئەو زانیارییەی کە کار بکاتە سەر نرخی بەشی کۆمپانیایەك لە کۆمپانیاکان، دەبێ پابەستی یاسا و دەستوورێکی مەعقوول بێ بەتایبەتی بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێ لەم مەسەلە بازرگانییانە بکۆڵێتەوە و ئاگای لە هەموو شتێك هەبێ، بەڵام هەنووکە کە ئەم مەبدەئە کەمتر ڕەزامەندیی لەسەرە، جا بۆیە زانیارییەکی زۆر لە چاوی خەڵکی بەدوور دەبێ. لە هەندێ وڵاتدا یاسای تازە دارێژراوە، بۆ پاراستنی فەرمانبەران و کارمەندان، بەتایبەتی ئەوانەی کە پەردە لەسەر شتە شاراوەکان هەڵدەدەنەوە، هەر شتێك کە هەڕەشە لە خۆشی و سەلامەتیی خەڵکی بکات. ئەم جۆرە یاسایە لە ئەمریکادا هەیە، کە تایبەتە بەتەندروستی و خۆشیی ئەو فەرمانبەر و کارمەندانە، ئەم یاسایە ڕێگە بە سەربەستیی قسەکردن بەهەموو کەرتە تایبەتییەکانی دەدا، بە فەرمانبەرە حکوومییە ناوخۆیی و دەوڵەتییەکان، لە وەختی جێبەجێ کردنی یاسا فیدراڵییەکان لە هەموو هەڕەشەیەك، ئەو یاسانە، دەیان پاراستن.

ئەم مەسەلەیە لەلایەن دەستەی چاپگەرانی ئوسترالی-ش بە هەند وەرگیرا و حیسابی بۆ کرا، ئامادەش بوو، سکاڵانامەی هەموو کەسێك دژ بەهەموو جۆر و چەشنەکانی بڵاوکردنەوە و چاپەمەنی وەربگرێ بێ ئەوەی هەق و مافەکانی دەزگا و کەناڵی چاپەمەنییەکان فەرامۆش بکات.

لە خەرمانانی ١٩٩١دا ئەم دەستەیە گفتوگۆیان لەسەر ئەوە کرد کە پاراستنی ئەو کەسانەی هەق دەڵێن، خەڵکی لە هەڵە و کەموکوڕییەکان ئاگادار دەکەنەوە، بایەخی پێ بدرێ و تەنیا لە سنووری هەندێ تاوان و پیسبوونی ژینگەدا نەمێنێ و بەڵکو مەودا و بازنەی گاڵەدان لە هەڵە و عەیبەکان تا بێ بەرفراوانتر بکرێ، یاسای تایبەتی بۆ پاراستنی هەقخوازان و دەنگ هەڵبڕانی دادپەروەری دەرچوو، دیارە ئوسترالیا

یاسای باوی خۆی لە یاسا باوەکانی بریتانیا خواست. ئەم دەستەیە وتی:

«ئەم دەستەیە بڕوای وایە کە پاراستنی ئەو کەسانەی لە هەق و ناهەق دەنگ هەڵدەبڕن، بۆ حاڵی حازر و لەژێر ئەم یاسا ئاساییەدا دڵخۆشکەر نییە چونکە تەنیا ئەو کات دەچنەوە ژێر چەتری ئەو یاسا پاراستنە کە مافە ڕەواکانیان پێشێل دەکرێن. بۆ نموونە: وەختی مامەڵەکردنێکی نادروست و ناشرین دەرهەق بەفەرمانبەران، واتە هەندێ جار بەئاگا هاتن بۆ پاراستنی ڕۆژنامەنووسان و هەق پەرستان و ماف پەروەران وەختێ دەبێ کە ئەوان لەلایەن هەندێ کەس و لایەن و دەزگا و دەسەڵاتدارەوە ناهەقییان دەرهەق کراوە.

هیچ یاسایەکی ئەوتۆش نییە کە ڕاستەوخۆ هەر کارێکی تۆڵە خوازانە قەدەغە بکات یان سزا بدات، هەموو جۆرە تۆڵەیەکی نادروستیش هی ئەوە نییە، بخرێتە بەردەمی دادگا. مەسەلە ڕوون و ئاشکراش نییە؛ چونکە هەقی لە گاڵەدان و بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان نەبووەتە مافێکی بنەڕەتی، زۆر جاران وەفای کارمەند و فەرمانبەر و بەکرێگیراوەکان بۆ خاوەن کارەکان بەڕادەیەك جەختی لەسەر دەکرێ کە دەبێتە مایەی فەرامۆشکردنی یان سەرنەکەوتن لە ئاڕاستەکردنی ئەو وەفا و خۆ جەخت کردنە، بەتایبەتی فەرمانبەرە حکوومییەکان کە دەبێ بەرانبەر بەجەماوەر ئەو وەفا و ئەو خۆ تەرخان کردنەیان هەبێ. ئەوەش وەخت بەخەسار دانە و دڵخۆشکەر نییە، چونکە زۆربەی خەڵکی ئامادە نین ڕووبەڕووی خاوەن کارەکان ببنەوە و وەخت و توانای خۆیان بۆ دادوەرییە درێژخایەنەکان تەرخان بکەن».

بەڕوونی دیارە کە مەسەلەی هاندانی لەگاڵەدان و بڵاوکردنەوە و ئاگادار کردنەوەی خەڵکی بەتەنیا هەر لە مەداری تەندروستی و سەلامەتی ناسووڕێتەوە. گەرچی مەیدانی تەندروستیی ئادەمیزاد و پاکی

ژینگە جێی بایەخە. هەقی زانین پتر زەخمی دەدرێتێ بەتایبەتی ئەو وەختەی فەرمانبەر و کارمەندان هان دەدرێن هەر کە تاوانێکیان یان هەر کارێکی دژ بەکۆمەڵیان هەست پێ کرد، قسە بکەن و خەڵکی لەو حکوومەتە یان لەو کەرتە تایبەتییەی کە کاری نابەجێی ئەنجام داوە، ئاگادار بکەنەوە و لێیان لە گاڵە بدەن.

خێ: بەدەوڵەت کردن، پەرەسەندن و پێشکەوتنی بەردەوامی دەزگا و پێکهاتە رامیارییە نێو نەتەوەییەکان زۆر گرنگە، حکوومەتە نەتەوەییەکان دەسەڵاتی خۆیان یان بەشێك لەو دەسەڵاتەیان دۆڕاند، سەبارەت بەهەموو ئەو مەسەلانەی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بەژیان و خۆگوزەرانیی خەڵکەوە هەبوو، وەکو سیاسەتی ناوخۆیی یان هاریکاریی نێوان پۆلیسی نێو نەتەوەیی...هتد.

لە هەمان کاتدا مەیلێك هەیە، بەلای پتر دابەشکردنی وردتری یەکەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و کەلتووریی سەربەخۆ، (وەك دەوڵەتە سەربەخۆکانی کۆمنویلث کەچی هەموو ڕێکخستنەکانی ناوەندیی ئاسایش، وەکو خۆیان دەمێننەوە. باشە ڕۆژنامەنووسان چۆن مامەڵە لەگەڵ دامەزراوە سیاسییەکاندا بکەن کە بێباك و کەمتەرخەمن و سنووری کارکردنیشیان لە بازنەی نەتەوەیی تێپەڕ دەکا...؟ سنووری ئەو هەقی گەیشتن بەدەروازەکانی زانین تا چ ئاستێکە کە پەیوەندیی بە قازانج و بەرژەوەندیی خەڵکەوە هەبێ، بەتایبەتی لە یەکەیەکی سەربەخۆدا، کە تیایدا ئەو زانیارییە باڵاتر و لە سەرووی مەسەلە نەتەوەییەکەوە سەیر بکرێ.؟

ڕێ: ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئاژانسەکان لە حاڵەتی ململانێی چەکدارانەدا: زۆربەی وڵاتان کۆتوبەندی توند دەخەنە دەستوپێی هەر ڕاگەیاندن و بڵاوکراوەیەك کە پەیوەندیی بەجووڵە و موناوەراتی

سەربازیی ولاتانی ترەوە هەبێ مەیلەکە ڕووەو کەمتر کردنەوەی پتری ئەو سەربەخۆ بوونە و سەربەستیی گەڕان و سۆراغ و پشکنینە، کۆسپ خستنە سەر ڕێی پەیامنێرانی جەنگە. بۆ نموونە لە پاش جەنگی ئەمریکا لە ڤێتنام (کاتێ بۆ هەموو ڕاپۆرتنووسێکی ئازا هەبوو بگاتە سەرچاوەکانی زانیاری) پێنتاگۆن هەموو هەوڵی خۆی تەرخان کرد کە ڕێگە لە گەیشتن بە سەرچاوەکان بگرێ و نەهێڵێ ئەو هەواڵانەش بزانن کە نارەسمین و هیچ کۆتوپەندێکیان لەسەر نییە و مۆڵەتیان پێ دراوە.

وەختێ هێرشبردنە سەر «گرینادا» لە گەلاڕێزانی ١٩٨٣دا، هەموو کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ئاژانسەکان دەمکوت کران. دوای گفتوگۆیەکی زۆر لەگەڵ دەزگاکانی بلاوکردنەوە و ئاژانسەکان و نووسەرانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان پێنتاگۆن نووسینگەیەکی ڕۆژنامەنووسیی دامەزراند بەمەرجێك عەسکەرییەکان سەرپەرشتیی بکەن کە بۆ یەکەم جار لە «پەنەما» لە مانگی سەرماوەرزی ١٩٨٩دا کە چوونە ناو ئەو ولاتە ئەو نووسینگەیە بوو بە مۆڵگەی زانیاریی کۆکردنەوە، بەلام ڕاپۆرتنووسان و هەواڵدەران وەك یاسایەك لە شەڕ و شۆڕ دوورخرابوونەوە، هەتا لە هەندێ حاڵەتدا دەترسێنران. هەمان شت بنگە یان نووسینگەی ڕۆژنامەنووسان، لە سەروەختی شەڕی کەنداو هەبوون کە تیایدا زۆر بەوردی و دیقەتەوە کۆنترۆڵی وەرگرتن و گەیاندنی هەموو زانیارییەك کرابوو، نووسین و لێدوانی سەربەخۆ کێشە و ململانێی هەردوو بەرەی شەڕەکە کارێکی ڕێ پێ نەدراو بوو.

زێ؛ ڕۆڵی ڕۆژنامەنووسە تەحقیقکارەکان: بەڕاستی ئەو ڕۆژنامەنووسانەی کە حەیا بەرن و نهێنیی پیاوە گەورەکان دەدرکێنن و بلاویان دەکەنەوە، ئەوەی کە لەبن بەڕەیە، دەیهێننە سەر بەڕە، ئا ئەوانە ڕۆڵێکی وایان بینی کە دەکرێ جێی ستایش بێ، چونکە

ئەوانە توانیویانە و دەتوانن پەردە لەسەر هەموو جۆرە نارێکی و فەسادێکی کارگێڕی و بەدڕەوشتی هەڵبدەنەوە، چ لە بەڕێوەبردنی کارە حکوومەتییەکان و چ سەربازییەکان، بێجگە لە هەموو ستەم و تاوانێکی دەسەڵاتداران، وەك لە بەندی ژمارە (١٩)دا نووسراوە:

«ڕۆژنامەگەری سۆراغکەر، هەقی گفتوگۆ و دەمەتەقێی جەماوەر لەسەر هەموو لاپەڕەکان و لەسەر هەموو کۆبوونەوە و باسەکانی نێو پەرلەمان بەڕەوا دەزانێ. سەرەڕای بەشداربوون لە مەسەلە و کێشە سیاسییەکاندا.

ئەو شێوە ڕاپۆرت و هەواڵانەی کە بەدوای هۆیەکانی هەر مەسەلەیەکدا دەگەڕێن، بەخشین و بڵاوکردنەوەی ئەو زانیارییانەی کە پەردەپۆش کرابوون، هەر بۆیە خوێنەران عەوداڵ و وێڵی ئەم جۆرە باسوخواسانە دەبن».

بەهەر حاڵ ئەو تەنگوچەڵەمە و مەترسییانەی کە لە ئاکامی پشکنین و گەڕان و سۆراغی زانیاریدا دێنە گۆڕێ ئەوە دەردەخەن و دەسەلمێنن کە دەبێ مەودا و مەداری سەربەستیی زانین و پەردە هەڵماڵین لەسەر ڕووی ڕاستی پتر و فراوانتر بکرێ، ئەو حەقیقەتانەی کە زۆر پێویست و بنەڕەتین بۆ هەموو کۆمەڵانی خەڵکی، ئەوانەی کە ئەو حەقیقەتانە کاردەکاتە سەر ژیانیان، ئەو حەقیقەتانەی کە بەشێکن لە بونیاتنان و بەشداری کردنی پرۆسێسی دیموکراسی، ناکرێ هەر ئاواهی لێیان بگەڕێن، هەر چۆنێکی ڕێك کەوت، بگەنە خەڵکی، لە هەر کەناڵ و کونێکەوە بێ ئەو حەقیقەتانە پەرت و بڵاوبن، ناکرێ بۆ بڵاوکردنەوەیان تەنیا پشت بە ملهوڕی و جورئەت ببەستین، یا ئەوەتا، هەندێ جار، بۆ ئەو ڕۆژنامەنووسانە بەجێیان بێڵین کە ئەگەر بەختیان یار بێ و چاکیان بۆ بێ، لە گەیاندنیاندا سەرکەوتن وەدەست بێنن.

## پشکنینی ڕاپۆڕتی وڵاتەکان:

وەختی گەیشتن بەزانیاری دەبێ بەپرینسپێکی کارپێکراو، وڵاتەکان بەسەر دوو خانەدا دابەش دەبن: ئەوانەی کە یاسای تایبەتییان هەیە سەبارەت بە سەربەستیی زانین، ئەو یاسایەی مافەکانی گەیشتن بەزانیاری دەستنیشان دەکا، لەوانەش (ئوسترالیا، کەنەدا، سوید و ئەمریکا)، بەشی دووەمیان ئەو وڵاتانەن کە بەشێوەیەکی سەرەکی بڕوایان بەوە هەیە کە هەر کەس و لایەنێك هەقی خۆیەتی لە بواری پەرتکردن و گرتنی زانیاریدا نهێنی پارێزبێ (بەندی ژمارە (١٩)، ڕاپۆرتی جیهانی- ١٩٩١).

دوو بواری سەرەکی لەبەردەم سەربەستیی زانیندا هەیە. یەکەمیان هەقی پشکنین و ڕاستکردنەوەی هەر دۆکیومێنتێکە کە پەیوەندیی بەهاوڵاتییەوە هەبێ. هەتا لە ئەمریکاش کە هیچ «بزووتنەوەیەکی سەربەستی زانین»ی تیا نییە حکوومەتەکان سیستمی وایان داڕشتووە کە ئەم جۆرە کارەی گەیشتن بە زانیاریی و پشکنین و ڕاستکردنەوەی دۆکیومێنتەکانی هاوڵاتی بەڕەوا دەزانین. دووەم بوار، ئەو ریفراندۆمەی کە لە یەکە بەیەکەی ئەو وڵاتانەدا ئەنجام دراوە، ئەوە دەردەخات کە تا چ مەودایەك ڕۆژنامەنووسان، بەپێی بواری دووەم، ڕێیان لەبەردەم خۆش دەبێ کە بەڕاستی یارمەتیی جەماوەر بدەن کە بە«هەقی زانین» بگات.

## ڕاپۆرتی یەکەم: دانیمارك

ژمارەی دانیشتووان: ٥.١٣٠.٠٠٠

ڕادەی خوێندەواری: ٩٩٪

ڕادیۆ: یەك ڕادیۆ بۆ هەر (٢.٤) کەسێك

تەلەفزیۆن: یەك دانە بۆ هەر (٢.٧) کەسێك

ژمارەی ڕۆژنامەکان (٤٧)

ژمارەی گۆڤار و بڵاوکراوە وەرزییەکان: (٢٢٠)

ساڵی مۆرکردنی پەیمانی ڕامیاریی و مەدەنی لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان ١٩٧٢.

* سەبارەت بە سەربەستیی زانین دانیمارك هیچ یاساو بڕیارێکی دیاریکراوی نییە. بەهەر حاڵ «بڕیاری گەیشتن بەدەروازەکانی زانیاری» لە گەلاڕێزانی ١٩٨٧دا بوو بە یاسایەکی کار پێکراو: بەو مانایەی وەدەستهێنانی زانیاری لە سەرچاوە دەسەڵاتدارەکانی حکوومەتەوە حەڵاڵ کرا. جگە لەوەش بڕیارێکی تر دەرچوو کە بەڕەسمی بەڕێوەبەرایەتیی داد، زامنی ئەوەی کرد کە دەکرێ هەموو زانیارییەك لە دادگاکانەوە وەربگیرێ.

بەگوێرەی بڕیارێك سەبارەت بە کۆکردنەوەی زانیاری کە لەلای دەسەڵاتدارە حکوومەتییەکانە، ڕۆژنامەنووسان مافی ئەوەیان دەبێ کە داوای زانیاری و هەموو جۆرە دۆکیومێنتێك لە هەموو بەش و دەزگاکانی میری بکەن (وەزارەت، هەموو دەزگا و بەڕێوەبەرایەتییە حکوومییەکان، دەستەڵاتە ناوخۆییەکان). هەروەها دەتوانن زانیاری و دۆکیومێنتەکان لە بەشی تۆماری گشت کۆمپانیا و نووسینگە مەدەنی و حکوومییەکان وەربگرن.

ئەم بڕیارە هیچ جۆرە زانیارییەك ناگرێتەوە کە پەیوەندیی بەهەر مەعلووماتێکی ژیانی کۆمەڵایەتیی یەکەکانی نێو کۆمەڵەوە هەبێ، یان هەر جۆرە حەقیقەتێك، پەیوەندیشی بە کاغەزە ناوخۆییەکانەوە نییە یان هەتا ئەو نامە و دۆکیومێنتانەی لە نێو نووسینگە و وەکالەتەکانی کۆمپانیاکان دەستا و دەست دەکرێت، خۆی لە قەرەی ئاسایشی دەوڵەتیش نادات (کاروباری دەرەوە... هتد)، جگەلەوەش، هەموو ئەو دۆکیومێنتانەی کە لە کۆبوونەوەکانی وەزیرانی دەوڵەت یان لە دەستەی سەرەتاییی تەشریعات و یاساوە کۆدەبنەوە بەر ئەم بڕیارە ناکەون، کەسیش مافی ئەوەی نابێ لەم حاڵەتانەدا داوای زانیاری بکات.

دانیمارك یاسایەکی ڕەسمیی بۆ پاراستنی نهێنییە ڕەسمییەکان نییە، بەڵام هەموو خزمەتێکی ئیستخباریانەی پۆلیس و پاراستن و بەرگری لە بواری سیاسەتی دەرەکیدا بەچەندەها پەیمان و بەڵێنی پڕ لە متمانە بەستراونەتەوە. بەگوێرەی یاسایەکی حکوومی لەسەر هەموو کارمەندێك و فەرمانبەرێك پێویستە کە نهێنیی پیشەکەی خۆی بپارێزێ.

بەپێی بەندی ژمارە (١٩)ی ڕاپۆرتی جیهانی ڕێگە دراوە کە هەر بابەتێك بڵاو بکرێتەوە، یان هەر زانیارییەك گەر دزەی کردبێ و پەرت بووبێ، ئەم چەشنە کارە چیتر بەهەڵە و تاوان لە قەڵەم نادرێ بەمەرجێك ئەو زانیارییانە پەیوەندییان بە بەرگری و ئاسایشی دەوڵەتەوە نەبێ.

«بڕیاری بەڕێوەبەرایەتیی داد»یش لەم بوارەدا کۆمەڵێ کۆتوبەندی لەسەر پەرت بوونی زانیاری داناوە کە پەیوەندییان بەبڕیارەکانی ناو دادگاوە، هەیە لەسەر هەموو تاوان و خراپەیەك، ئامانجی ئەم سنوور دانانەش بۆ پاراستنی کەسایەتی و پێناسەی ئەو تاوانبارانەیە یان ئەوانەی تاوانبار کراون و دادگا سەرگەرمی لێکۆڵینەوەیە تا ڕاستیی مەسەلەکە بسەلمێنێ.

بەپێی «یاسای سزاکان»، بڕیار دراوە کە ئەگەر هەر کەسێك زاتی ئەوەی کرد زانیارییەك بڵاوبکاتەوە کە بەمەرجی متمانە و نهێنی پاراستن وەری گرتبێ، ئەوە دەبێ چاوەڕێی ئەوەش بکات کە نزیکەی شەش مانگێك بەندیخانە ببینێ. بەهەر حاڵ ئەم بەندە لە ڕووی مەبدەئییەوە ڕاستە، بەڵام کەم جار کاری پێ کراوە.

سەبارەت بە وەدەستهێنانی بەڵگەنامە حکوومییەکانیش؛ دەستووری تایبەت بەمەودای بڵاوبوونەوەی زانیارییە حکوومییەکان دەرچووە کە تیایدا داوا لە ڕۆژنامەنووسەکان دەکا و ئەوانی کە بەدوای زانیاریدا دەگەڕێن، ئەو مەسەلە تایبەتییانە و ناو و نیشانی بەڵگەنامەکان دەستنیشان بکەن کە بەدوایاندا وێڵن.

هەر لەبەر ئەم هۆیە «یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی دانیمارك»، داوای لە هەموو لایەنە دەسەڵاتدارەکانی ناوخۆ کرد کە چەندەها لیستەی زانیاری بەردەستیان هەبێ، کە ئەگەر بکرێ هەموو لیستە و نووسراو و دۆکیومێنتەکان بدرێن بە چەندەها شارەوانی بۆ ئەوەی هەر کاتێ ڕۆژنامەنووسان مەبەستیان بێ، بەئاسانی بخرێنە بەردەست. بەهەر حاڵ یاسا ڕێگە بەوەش نادات کە ئەم لیستانە بگەنە دەستی هەموو کەسێك، لەسەر ئاستی نەتەوەش نەبووە بە یاسا.

گرفتێکی تر ئەوەیە کە سنوور بۆ هەموو دزە کردنێکی زانیاری دانراوە، ئەگەر لەو بەڵگەنامە ناوخۆییانەدا بن کە هێشتا کاریان پێ دەکرێ. لەوەتەی ئەو دەستوورە دەرچووە کە پەیوەندیدارە بە زانیارییە حکوومییەکان و مەودای دزە کردن و پەرتبوونیان مەیلێکی زۆر بۆ ئەوە هەیە کە فەرمانبەرانی حکوومەت لە ڕێگەی نووسراو و بەڵگەنامە ناوخۆییەکانەوە یەکدی دەدوێنن یان بەقسەکردنی ڕاستەوخۆ، تاوەکو نەهێڵن هیچ زانیارییەك لەسەر مەسەلە ناسکەکان بەم لاو بەو لادا پەرت بێ.

له هەندێ حاڵەتی تایبەتدا، شکایەتی خەڵکی لە ڕێگەی نوێنەرێکی پەرلەمان بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بەپێی «ڕاپۆرتی جیهانی»ی ساڵی ۱۹۹۱دا و لە بەندی ژمارە ۱۹دا هاتووە کە (لە- شوباتی ۱۹۹۰دا بڕیار درا کە هەقی گەیشتن و بەدەستهێنانی زانیاری لەو بەڵگەنامانەی کە کۆمیتە جیا جیاکان ئامادەیان دەکەن، مەیسەر بکرێ، ئەو کۆمیتانەی کە ئەندامەکانی کۆمەڵێ فەرمانبەری مەدەنیی وەزارەتە جیا جیاکانن. بۆ ئەم مەبەستە لێژنەیەکی سەرەکی و دوانی تر کە لقی لێژنە سەرەکییەکە بوون لە ساڵی ۱۹۸۷ەوە دامەزراون تا بتوانن چاودێریی هەموو ڕاپۆرتەکان بکەن. بەر لەو بڕیارە بۆ ڕۆژنامەنووسەکان نەبوو دەستیان بگاتە ئەو دۆکیومێنتانەی کە ئەو کۆمیتانە ئامادەیان دەکەن، بەو بیانووەی کە دۆکیومێنتەکان ناوخۆیین و ئەو بڕیارە نایان گرێتەوە. بەپێی بڕیارێکی کۆمسیۆنەری پەرلەمان، هەموو ئەو دۆکیومێنتانەی کە تایبەتی بۆ کۆبوونەوە وەزارەتییەکان ئامادە نەکراون، بەڵکو لەلایەن فەرمانبەرە مەدەنییەکانەوە بەکار دەبرێن، دەکرێ بخرێنە بەردەست و هەڵاوێرد نەکرێن، هەر کەسێك ویستی دەستی بیانگاتێ.

## وەدەستهێنانی مەحزەری هەموو دانیشتنەکانی لایەنە دەسەڵاتدارەکانی حکوومەت:

وەك پرنسیپل، هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك لەبەردەم ڕۆژنامەنووسەکان و خەڵکی تردا نییە، بۆیان هەیە لە هەموو دانیشتنەکانی لایەنە دەسەڵاتدارەکانی ناوخۆیی و ناوچەیی حکوومەت ئامادە بن و ڕاپۆرتی تایبەتی خۆشیان هەبێ. لە ڕووی پراکتیکییەوە بەشێك لە دانیشتنە بەردەوامەکانی ئەنجومەنی شار/ ئەنجومەنی ناوچە «دانیشتنی داخراو» بن، وتوویژ لەسەر ئەو بابەتانە کراوە کە دەستوور و یاسایەکی حکوومەتی دەستنیشانی کردوون، لەوانەش (هەموو ئەو مەسەلانەی کە

پەیوەندییان بەتاکە کەسەکانی نێو کۆمەڵەوە هەیە، یان بابەتێکی دارایی).

بەهەر حاڵ هەموو بڕیارەکان دەبێ لە دوایدا ڕابگەیەنرێن کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی سەرەکی و کۆمیتە لاوەکییەکان داخراو بوون، بڕیارەکانیش لە کۆتاییدا ڕادەگەیەنران. بۆ ڕاپۆرت نووسین لەسەر مەسەلە ڕامیاریی و حکوومەتییەکان هیچ کۆتوبەندێك نییە. بەهەر حاڵ، لەوەختی هەڵبژاردندا کەناڵ و میدیا مەدەنییەکانی ڕاگەیاندن یاسای ناوخۆیی تایبەتیان هەیە کە مەرجە بۆ پڕوپاگەندەکانی هەڵبژاردن هاوسەنگی بپارێزن.

## وەدەستهێنانی مەحزەری دانیشتنەکانی پەرلەمان:

هەموو گفتوگۆ و دەمەتەقێ ڕامیارییەکانی ناو پەرلەمان، موڵکی هەموانن و دەبێ خەڵکی ئاگایان لێیان بێ، مەحزەری دانیشتنەکانی دەستەی تەشریعی، بەشێوەیەکی سەرەکی، لە هەموو کۆبوونەوەکانی کۆمیتەکانیدا بەنهێنی دەپارێزرا، ئەو بڕیارانەش کە ڕۆژنامەنووسان دوایی ڕاپۆرتی خۆیان لەسەر دەنووسی. هەموو ئەو مەسەلانەی کە پەیوەندییان بەخەڵکەوە هەیە و بۆ ڕای گشتی گرنگن، کێشەکانی نێو دادگاکان یان هەر دەزگایەکی تر دەکرێ بە داخراوەیی بمێننەوە، ئاساییشە گەر هەموو خەڵکی لێیان ئاگادار بێ. بەهەر حاڵ ئامانجەکان هەمیشە دواتر دەخرێنە بەرچاوی خەڵکی. کۆبوونەوەکانی ژمارەیەك لە دادگاکانی ئیستئناف هەر بەداخراوەیی دەمێننەوە، بەڵام بڕیارەکانیان ڕادەگەیەنرێن.

گەیشتن بەدادگا: وەك سەرەتا دەبێ لەلای هەموان ئاشکرا بێ کە دەرگای دادگا لەبەردەم هەموو خەڵکیدا والایە، بەهەر حاڵ دادوەر لە هەندێ حاڵەتی تایبەتیدا بۆی هەیە دەرگا دابخات (وەك مەسەلەی تاوانە

سێکسییەکان، تلیاك، ئیعتیباراتی شایەتی و شایەتەکان، کاروباری دەرەکیی دەوڵەت، کێشە سەربازییەکان... هتد). وێنەگرتن و تۆماری ڤیدیۆ زۆربەی وەخت قەدەغەیە، کەچی وێنەکێشان لە هۆڵی دادگادا زۆربەی جار ڕێ پێ دراوە.

جگە لەوانەی سەرەوە **گەلێ** کێشە **هەن** کە بەناوبژی **کردن**، چارەسەر دەکرێن (پیشەسازی، **دەزگا** و کۆمپانیا **تایبەتییەکان** .. **هتد**)، ئەو شتانەی هی ئەوە نین خەڵکی **بیانزانن**، ڕاپۆرتە**کانی** پەیوەندیدار **بەناوبژی** کردنە لەسەر بەرژەوەندی **و قازانجی** لایەنە **ناکۆکەکان** دەوەستێ.

سەفەر و ڤیزا: **هیچ** کۆتوبەندێکی **لەسەر** نییە.

## ڕاپۆرتی دووەم: فەرەنسا

ژمارەی دانیشتووان: ٥٦.٢٠٠.٠٠٠

**ڕێژەی خوێندەواری:** ٩٩٪

**ڕادیۆکان:** یەك ڕادیۆ بۆ هەر (١.١)کەسێك

**تەلەفزیۆن:** یەك تەلەفزیۆن بۆ هەر (٢.٥) کەسێك

**ژمارەی ڕۆژنامەکان:** (٩٢)

**گۆڤار و بڵاوکراوە وەرزییەکان:** (٢٢.٤٤٣)

سالّی مۆرکردنی پەیمانی ڕامیاری و مەدەنی لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان: ١٩٨٠

لە فەرەنسا، ئەو یاسایانەی سەبارەت بەمافی گەیشتن بەزانیارییەکان، داڕێژرابوون بەپێی یاساکەی ساڵی ١٩٧٨دا گۆڕان و توانییان هاوسەنگییەك لەنێوان سەربەستی و مەودای زانیندا بدۆزنەوە، لەڕووی مەبدەئییەوە بۆ هەر تاکێکی کۆمەڵ هەبوو بگاتە هەر داتاو مەعلووماتێکی عەمبارکراوی نێو کۆمپیوتەر یان بەدەست نووسراو، لە یاسای گەلاوێژی ١٩٧٨دا سەبارەت بەدەستگیرکردنی دۆکیومێنتە حکوومییەکان و یاسای مانگی گەلاوێژی ١٩٧٩دا گۆڕانێکی بەسەردا هات بەوەی کە چەند بڕیارێکی وایان دەرکرد کە ڕێگە لە گەیشتن بەزانیارییەکان بگرێ و داواشی لە میری کرد کە بۆ ئەم بڕیارانە بڕو بیانوو بدۆزێتەوە.

یاسای گەیشتن بەدۆکیومێنتە حکوومییەکان کۆتوبەندی خستە سەر وەدەستهێنانی زانیاری تاوەکو نهێنییە پیشەسازی و بازرگانییەکان بپارێزرێن. ئەوەشیان ململانێی خولّقاند و شەڕی بەرژەوەندی نێوان تاکی بەر خۆر و خودانی کالاّکانی نایەوە. بەم شێوەیە زانیاری لەسەر

بەژەهراوی بوونی هەر بەرهەمێك و خواردەمەنییەك یان كارتێكردنی ڕەگەزە دژوار و پیسكەرەكان، دەستی بەسەردا دەگیرێ تا نەهێڵن كەس پێیان بزانێ. سەبارەت بەئاسایشی نەتەوە، پاراستنی شیرازەی كۆمەڵ. كێشە دادوەرییەكان و پەیوەندییە گرنگەكانی نێو فەرەنسا و وڵاتانی تر، حسێبی وردیان بۆ كراوە و لەم بوارەش كۆتوبەندی زۆر لەسەر پەرتبوونی زانیاری دانراون.

بەشی شەشەم لەم یاسایە ژمارەیەك حاڵەتی هەژمار كردووە كە حسێبی نهێنییان بۆ دەكا و هەق بەشاردنەوە و نەدركاندنیان دەخاتەوە دەست لایەنە نهێنی پارێزەكان. لەوانەش: (بەرگری، سیاسەتی دەرەوە، دارایی، ئاسایشی نەتەوە، بەرژەوەندیی گشتی، پشكنینی تەكنیكی و بازرگانی).

دوو بەندی سەرەكی ئەو دەسەڵات و هێزە بەحكوومەت دەداتەوە كە هەر وەختێ بیەوێ زانیارییەكان لای خۆی گل بداتەوە، بەم پێیە هیچ كۆمسیۆن و لایەنێك، كە مەبەستیەتی بەڵگەنامەكانی حكوومەتی دەستگیر بێ، ئەو هێز و هەقەی نابێ بەزۆردارەكی لەسەر داوای هەر كەسێك بێ، دۆكیومێنت و بەڵگەنامەكان بخاتە چنگی.

بۆ پاراستنی ژیانی تاكە كەسەكانی نێو كۆمەڵ، یاسای دروست دارێژراوە، دادگاكان توانیویانە كەڵك لە بەشی نۆیەمی دەستووری مەدەنی- ببینن. سەفەرێكیان ژنە ئەكتەرێك توانیی هەقی خۆی لە ڕۆژنامەیەك بستێنێ و بگرە سزاش بدرێ لە سۆنگەی ئەوەی ڕۆژنامەكە وای بڵاو كردبووەوە كە ئەو ژنە ئەكتەرە منالی فرێ داوە.

## گەیشتن بە مەحزەری دانیشتنەكانی لایەنە دەسەڵاتدارەكانی حكوومەت:

هیچ كۆت و سنوور بەندییەكی یاسایی وا نییە كە ڕێ لە ڕۆژنامەنووسان بگرێ نەتوانن لەو دانیشتنانە ئامادەبن و ڕاپۆرتی خۆیان لەسەر كێشە

ناوخۆیی و ناوچەییەکان هەبێ و بڵاوی بکەنەوە یان هەتا سەبارەت بەم مەسەلە سیاسی و دەوڵەتی و جەماوەرییەکان. بەهەر حاڵ، **تەنیا** شتێك کە ڕۆژنامەنووسان دەبێ وریای بن هەقە مەدەنییەکانە کە **تیایدا** هەر **تاکێکی** کۆمەڵ بۆی هەبێ نهێنی لای خۆی بپارێزێ.

## گەیشتن بە مەحزەری دانیشتنەکانی پەرلەمان:

بۆ **ئەمەیان** هیچ **کۆسپ** و تەگەر**ەیەك** نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی **زەحمەتە** **هەر** (٢٦٠٠٠) **بیست** و شەش **هەزار** ڕۆژنامەنووس لە **فەرەنسادا لە** **دانیشتنەکانا** ئامادەبن و بە**ئاسانی** دەستیان بگاتە مەحزەرەکانی دەستەی تەشریعی، **هەر** ڕۆژنامە**یەك هەقی** خۆیەتی کە پەیامنێرێك یان چەند **پەیامنێرێك** بنێرێتە ناو پە**رلەمان**. ڕەنگە پەرلەمان خۆیشی بڕیار لەسەر ئەوە بدات بەدزییەوە دوور **لە هەڵك** و ڕۆژنامەنووسان دابنیشێ. بەڵام لە دوای جەنگی دووەمی **جیهانییەوە**، حاڵەتێکی وا ڕووی نەداوە.

سەبارەت بەو مەحزەرانەی **کە پەیوەندییان** بە داوا و بەرژەوەندیی خەڵکەوە هەیە، چ لە دادگا یان **هەر دامودەزگایەکی** نا پەرلەمانی بێ. بەڵام سیفەتی حکوومەتی **هەبێ**.. تەنیا لەو حاڵەتەدا چالاکی و مەحزەرەکان کۆتوبەندیان دەخر**ێتە سەر**. **گەر** مەسەلەکە وا بکەو**ێتەوە** کە ئاسایشی گشتی تێك بدات، یان **پەیوەندیی بە** بەرگری کردنەوە **هەبێ**، یان قۆناغەکانی سەرەتایی دادگایی کردنی **تاوانبارکراوەکان**. بەڵام ئیدارەی ئەم دامودەزگایانە یان حاکم بۆی **هەیە**، هەمیشە زانیارییان پێ ببەخشێ.

## گەیشتن بە مەحزەری دانیشتنەکانی دادگا:

بۆ ئەوەشیان هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك نییە، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێ کە دادگا زۆر مەبەستیەتی ئەو دادوەرییە بەدزییەوە بکرێ (بۆ نموونە ئەگەر

منالێك تەمەنی نەگەیشتبێتە هەژدەو خەراپ كرابێ یا لە كێشەی ئەسڵی دایك و باوكی بكوڵدرێتەوە). لەم حاڵەتانەدا دەكرێ دادوەرییەكە بەدزییەوە ئەنجام بدرێ.

دەكرێ ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و وێنەگر لە سەرەتای دانیشتنەكانا ئامادەبن، بەمەرجێ ڕەزامەندیی وەزارەتی دادی لەسەر بێ، بەڵام مەرج نییە بۆ هەموو دانیشتنەكانی هەر دادوەرییەك ڕێیان پێ بدرێ.

ئەمەیان پەیامنێرەكان ناگرێتەوە، لەم دواییەدا حیسابی تایبەت بۆ هەندێ بوار كراوە: بۆ نموونە: لە شاری «لیۆن» سەبارەت بەدادوەریی تاوانبارێكی جەنگ فلیمێكی تەواوی لەسەر گیرا. بەڵام ئەو فلیمە و تۆماركردنی تا پەنجا ساڵی تر هەر بەنهێنی دەمێنێتەوە و لەلایەن وەزارەتی داد بەتەقەتی هەڵدەگیرێ.

لە فەرەنسا هیچ كۆسپ و تەگەرەیەك لە بەردەم سەفەری ڕۆژنامەنووساندا نییە.

## ڕاپۆرتی سێیەم: یابان

ژمارەی دانیشتووان: ١٢٣.٨٠٠.٠٠٠

ڕێژەی خوێندەواری: ٩٩٪

ڕادیۆ: یەك ڕادیۆ بۆ هەر (١.٣) کەسێك

تەلەفزیۆن: یەك دانە بۆ هەر (٤.١) کەسێك

ژمارەی ڕۆژنامەکان: (١٢٤)

گۆڤار و بڵاوکراوە وەرزییەکان: (٢.١٣٨)

مۆر کردنی پەیمانی ڕامیاری و مەدەنی لەگەڵ (UN) ١٩٧٩

هەر چەندە ژمارەیەك لە حکوومەتە ناوخۆییەکانی یابان، بڕیار و یاسای تایبەتییان سەبارەت بە سەربەستیی زانین، هەیە، بەڵام چەمکی سەربەستی تا هەنووکەش لەسەر ئاستی نەتەوەیی و نیشتمانی نەخراوەتە نێو هەموو دامودەزگاکان.

تەنیا پانزە ساڵ لەمەوبەر بوو کە «سیستمی سەربەستیی زانین»، لە یابان هاتە کایەوە. لەسەر ئاستی حکوومەتی ناوخۆیی بڕیار و دەستوورەکانی سەربەستیی زانین لە هەشتاکانەوە (١٩٨٠)ەوە بوون بە بەرنامەی کارکردن بەڵام تا حاڵی حازر لە هەموو وڵاتدا تەنها (٥٪)ی حکوومەتە ناوخۆییەکان بەڕاستی چەمکی سەربەستیی زانینیان لەنێو دامودەزگاکانی خۆیان کردووە بەیاساو پەیڕەوی دەکەن.

یەکەم شت کە سەرنجی هەموو خەڵکی سەبارەت بەسیستمەکانی سەربەستیی زانین ڕاکێشا، مەسەلەی پەردەلادان بوو لەسەر مەسەلەی «لۆکهێد»ی ساڵی ١٩٧٦ کە لە ئەمریکا بەئاشکرا ئەم مەسەلەیە شەنوکەو کرا، ئەوەیان بوو بە جێی مشتومڕی خەڵکی یابان-یش، هەر لە ئەنجامی ئەزموونی یابانییەکان لەگەڵ ئەم کێشەیەدا، زیاتر چاویان کرایەوە،

لەوەش بەئاگا هاتن کە دەمێ ساڵە لە گەیشتن بە سەرچاوەکانی زانیاری بێبەش بوون و ئەو هەقەیان فەرامۆش کراوە.

خەڵکی تا دەهات پتر بەپێویستیان دەزانی کە «دەستووری سەربەستیی زانین»ی ئەمریکی بکەن بەمۆدێل و پەیڕەوی بکەن، کە لە ساڵی ١٩٦٦ەوە لە ئەمریکا کاری پێ دەکرا یان ئەوەتا هەوڵ بدەن کۆمەڵێ یاسای هاوجۆری ئەو یاسایانەیان هەبێ کە دەقاودەق بەکەڵکی ئەوە بێ لە یابان لەسەری بڕۆن. لە ١٩٧٩دا کۆمیتەیەکی سەرەتایی بۆ دامەزراندنی سیستمی سەربەستیی زانین لە ویلایەتی «کاناگاوا»، دامەزرا کە لە تۆکیۆ-ی پایتەختەوە نزیکە، بەم شێوەیە هەنگاوێکی چەسپاو نرا بۆ خۆ ئامادەکردن بەمەبەستی بەکارهێنانی ئەو چەمکە لە هەموو دامودەزگاکان. ئەم پرۆسێسە کە ئامانجی سەربەستیی زانینی هەبوو بەتەواوی بووە جێی سەرنج و بایەخی هەموو ئیدارەکانی حکوومەتە ناوخۆیی و گشت گرووپ و کۆمەڵە و تاقمە شارنشینەکان.

لە ئەنجامی ئەو هەوڵەدا، لە شارێکی بچووک کە بەوڵاتی «یاماکاتا» ناسراوە و ژمارەی دانیشتووانیشی هەشت هەزار کەسە، لە مانگی ڕەشەمێی ١٩٨٢دا پەیڕەو کرا. پاشان ئەنجومەنی ویلایەتی «کاناگاوا»ش بەیەك دەنگ لە مانگی ڕەزبەر-ی ١٩٨٢دا پرۆژەی یاسایەکی پێشکەش کرد کە تیایدا پێشنیاری بڕیارێکیان کرد لەسەر سەربەستیی زانین. ئەوەشیان وەڵامێك بوو بۆ ئەو ڕاپۆرتەی کە کۆمیتەی ناوبراو ساز و ئامادەی کردبوو.

هەر چەندە ژمارەی ئەو ولایەتانەی کە پەیڕەوی چەمکی سەربەستیی زانینیان، کردووە گەیشتووەتە ١٧٠، وا چاوەڕوانیش دەکرێ کە ئەم ژمارەیە تا بێ بۆ لەمەودوا لە زیادبووندا بێ.

بەهەر حاڵ لەسەر ئاستی نەتەوە پەیڕەوکردنی ئەو ڕێبازی سەربەستی زانینە هێشتا ماویەتی بگاتە ئاکام.

لە گەلاویژی ۱۹۹۰دا نووسینگەی کارگێڕی و نووسینگەی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی حکوومەتی یابانی دوای شەش ساڵ لێکۆڵینەوە ڕاپۆرتێکی سەبارەت بە سیستمی سەربەستیی زانین بڵاو کردەوە. ئەم ڕاپۆرتە بەشێوەیەکی تایبەتی ئاماژەی کار پێکردن و حاڵی ئەو سیستمی سەربەستی زانینەی کرد کە لە ئەمریکادا هەیە، سەرەڕای هەندێ سیستمی سەربەستیی زانین لەلای حکوومەتە ناوخۆییەکانی یابان، ڕاپۆرتەکە تەنیا دەستنیشانی دیاردە و خاڵە خراپەکانی ئەو سیستمەی کردووە وەک لەم تێبینی و سەرنجانەی خوارەوە وەدەر دەکەوێ:

«هەندێ کەس و لایەن ئاماژەیان بەوە کرد کە سیستمی سەربەستیی زانین بۆ هەندێ مەبەست و نیازی وا بەکارهاتووە کە هەرگیز چاوەڕێ نەکراوە. بۆ نموونە: وەدەستهێنانی زانیاری سەبارەت بەکۆمپانیاکان تەنها لە پێناو ڕکەبەری و پێشبڕکێی قازانج و بەرژەوەندیی ئەم بەسەر ئەوی دیکەدا، یان بۆ ئەوە بوو بزانرێ تەحقیقات لەگەڵ تاوانبارێکدا گەیشتووەتە چ قۆناغێك، یان بۆ ئەوە بووە تا بزانرێ کێ زانیارییەکی دیاریکراوی داوە بەفڵانە کەس و فیسارە لایەن. لە ئەنجامی ئەم چەشنە کارانە ئیشی لایەنە دەسەڵاتدار و کارگوزارەکان لە چەندین شێوە و ڕێگەدا کۆسپ و تەگەرەی کەوتە بەردەم تا وای لێ هات زۆر زەحمەت بێ، یارمەتی و هاریکارییان لەلایەن کەس و لایەن و کۆمپانیا و فابریقە و سەندیکاکانەوە دەستگیر بێ، سەبارەت بەگەیشتنی بەحەقیقەتی دادگایی کردنی تاوانبارەکان و لێکۆڵینەوە لەسەر تاوانەکانیان بەتەواوی پەکی کەوت، بەگوێرەی قسەی ئەو چەند کەس و لایەنە ئەم هەموو کۆسپ و تەگەرە و پەککەوتنە دەگەڕێتەوە، بۆسیستمی سەربەستیی زانین».

بەهەر حاڵ، گەلی یابان هەنووکە لەوە بەئاگایە کە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگایەکی دیموکراسی «سیستمی سەربەستیی زانین»، زۆر پێویستە و ناکرێ چاوی لێ بپۆشرێ. لە ڕاستیدا زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی داوای

جێبەجێکردنی یاسا و بڕیارەکانی سەربەستیی زانینیان دەرکرد کە بەهەر شێوەیەك بێ دابمەزرێ، نەك تەنیا لە پێناو قازانج و بەرژەوەندی گەلی یابان خۆی. بەڵکو بۆ ئەوە بوو تا کۆمەڵگای جیهانی بڕوا بەوە بێنن کە یابانییەکان میللەتێکی دیموکراسی و ئازادیخوازن. یەکێك لە پێشنیارەکانی ئەمریکا بۆ یابان وەختی گفتوگۆ لەسەر چۆنییەتی دامەزراندنی سیستەمی ئەو سەربەستییە کرا ئەوە بوو کە بەندێکی سەربەخۆ داڕێژرێ بۆ پەردە لادان لەسەر هەموو زانیارییەك سەبارەت بەڕێکخراوەکان، ناوەڕۆکێکی دەمە تەقێ و مونازەرە و پەیامی ئاڵوگۆڕکراو لە نێوان لایەنەکان، ڕاپۆرتی کۆمیتەی ڕاوێژکارە جیاکان لە یابان، هەر چییەکی لە نێو دەزگاکانی حکوومەت و فابریقە و کۆمپانیا پیشەسازییەکان ڕوو دەدا، پەردەپۆش نەکرێ.

حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکانی یابان توانییان پرۆژەی یاسایەك سەبارەت بە«سەربەستیی زانین» بخەنە بەردەمی پەرلەمان، بەڵام بێ هوودە بوو. بەهەر حاڵ، لەبەر ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکانی مانگی گەلاوێژی ١٩٨٩دا پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان توانییان زۆربەی دەنگ بۆ کورسییەکانی ئەنجومەنی پیران وەدەست بێنن، بەم شێوەیە بواری ئەوە ڕەخسا کە سەربەستیی زانین ببێ بەکارنامەی ئەنجومەن بەمەرجێك هەموو پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان یەك ڕا و یەك ئامانج، بۆ ئەم مەبەستە کاربکەن. جا لەبەر ئەوە پێنج پارتی ئۆپۆزسیۆن پێکڕا پرۆژەی یاسای «سەربەستیی زانینیان» ئامادە کرد.

سیستەمەکانی سەربەستیی زانین-ی حکوومەتی یابان تەنیا ئامانجی ئەوە نییە کە ئەو هەقە بدا بە ڕۆژنامەنووسەکان دەستیان بگاتە هەموو هەواڵەکان و بڵاوی بکەنەوە، بەڵکو پتر گەرەنتیی ئەوەشی دا بەدانیشتووان کە هەقی ئەوەیان هەبێ، دەستیان بگاتە هەموو زانیارییەك کە لەلایەن حکوومەتەوە پەردەپۆش کرابێ.

بڕیاری سەربەستیی زانین-ی حکوومەتی لەسەر ئەم پرنسیپە دامەزراوە کە ناکرێ ئەم جۆرە زانیارییانەی لای خوارەوە بڵاو بکرێنەوە.

١- هەموو زانیاری و حەقیقەتێك کە پەیوەندیی بەژیانی نهێنیی تاکەکانی کۆمەڵەوە هەبێ.

٢- ئەو جۆرە زانیارییەی کە ڕەنگە بەبڵاو بوونەوەی بەتەواوی ڕێگە لە جێبەجێ کردنی دادپەروەرانەی کارەکانی حکوومەت بگرێ.

٣- نهێنییەکانی هەندێ دەستە وتاقم.

بەهەر حاڵ، هەر کاتێ بەرژەوەندی گشتیی خەڵکی، خێری پتری دایەوە گەر زانیارییەکی دیاریکراو پەردەی لەسەر هەڵدرایەوە و بڵاو بووەوە. ئەوە وا چاکترە ئەم جۆرە زانیارییە بدرێ بەخەڵکی، بۆ نموونە «ئەگەر بەبڵاو بوونەوەی تۆزێ زانیاری ژیان و تەندروستیی کەسێك لە مەترسی دوور بخرێتەوە ئەوە وا چاکترە کە یەك و دووی لێ نەکرێ».

یابان هیچ یاسایەکی بۆ نهێنییە ڕەسمییەکان دانەڕشتووە، بەڵام مەرجە فەرمانبەرانی حکوومەت نهێنییەکان بپارێزن لە ژێر یاسای خزمەتی گشتی و فەرمانبەرانیش خۆیان. ئەم یاسایە کۆسپ دەخاتە سەر ڕێی گەیشتن بەزانیاری، چونکە فەرمانبەران لەوە دەترسێن بەتاوانی نهێنی درکاندن سزا بدرێن، سەرەڕای ئەوەش گەر ڕۆژنامەنووسێك بەزۆر زانیارییەکی نهێنی لە فەرمانبەرێکی حکوومەت وەرگرت، ئەوە دەبێ چاوەڕێی ئەوەش بکا لە سزای ئەوەی پارەی لێ بسەندرێ، یان ئەوەتا ساڵێك بەند بکرێ.

## سیستمی یانەی چاپگەران:

هیچ کۆتوبەندێکی یاسایی لە یاباندا نییە کە ئەو هەقە بەڕۆژنامەنووسەکان نەدات، ئاگایان لە مەحزەری دانیشتنەکانی لایەنە

دەسەڵاتدارەکانی ناوخۆیی و ناوچەییەکان نەبێ، ڕۆژنامەنووسان مافی ئەوەیان هەیە ڕاپۆرتی خۆیان سەبارەت بەهەموو مەحزەری دانیشتنەکان هەبێ و ئاگاشیان لە هەموو کەینوبەینێکی سیاسی و جەماوەری هەبێ، بەهەر حاڵ جگە لە ڕۆژنامەنووسان ئەو یانەیە ڕێگەی بەکەسانی غەریب نەدەدا، ئەو سەربەستییە وەربگرن، بەڵکو بەچەندەها کۆتوبەند دەبەسترانەوە.

ئەم سیستەمە لە ساڵی ١٨٩٠دا هاتە کایەوە، کاتێ دەستەی یاسادانەرانی ئیمپراتۆری بۆ یەکەمجار دامەزرا. لە ئەنجامی ئەوەی دەستەی ناوبراو چەند هەنگاوێکی وای نا کە ڕێگا نەدرێ چالاکییەکان کە مەحزەری دانیشتنەکانی نێو هۆڵی پەرلەمان بگاتە دەست هەموو کەسێك و قەدەغە بکرێ، ئەوە بوو ڕۆژنامەنووسانی سەر بەچەندەها دەزگای چاپەمەنیی جیا و ڕۆژنامەکان بەیەکەوە و بەیەکدەنگ داوایان لە دەسەڵاتدارانی نێو دەستەی یاسا دانەران کرد کە ڕێگەیان پێ بدرێ، دەستیان بگاتە هەموو هەواڵەکان و سەربەستیی بڵاو کردنەوەشیان پێ بدرێ لە کەناڵە جیاکاندا. ئەوەیان ڕێی خۆش کرد کە یەکەم یانەی چاپگەران لە یابان دابمەزرێ. کەواتە دەکرێ بوترێ ئەو یانەی چاپگەرانە لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە دامەزرا بوو کە ببێتە ئامرازێك بۆ پەردە لادان لەسەر زانیاری بۆ هەموو خەڵکی بێ ئەوەی هیچ هێز و لایەنێکی دەسەڵاتدار بتوانێ ڕێی لێ بگرێ و بەڕاستیش بوو بە ڕێکخراوێکی پیشەگەرییانە کە بەهەق خاوەنی بڕیار و وەدەستهێنانی مافەکانی خۆی بێ.

لە ساڵی ١٩٤١دا کاتێ یابان کەوتە نێو دۆزەخی جەنگی دووەمی جیهانییەوە یانەی چاپگەران شێلگیرانە و سەرلەنوێ خۆی ڕێك خستەوە لە ژێر سایەی ئەو مەبدەئەی کە دەڵێ:

«هەر یانە و نوێنەری حکوومەتێك بێ»، بەم شێوەیە ئەو هەقانەی کە

سەربەخۆیانە هەر یانەیەك لە یانەكان هەیبوو لە دەستی دا. كۆنترۆڵكردنی هەر یەكێك لەو یانانە تا دەهات توندتر دەبوو تا وای لێ هات چالاكی و جووڵە و سەربەستیی رۆژنامەنووسان، پتر كۆتوبەندی خرایە دەستوپێ.

رۆژنامەنووسان رێگەیان پێ نەدەدرا هیچ شتێك بنووسن، تەنیا ئەو شتانە نەبێ كە بەئاشكرا لەرێی كەناڵە رەسمییەكانەوە بەهەموو خەڵكی دەگەیشت. خۆ ئەگەر ئەو یاسایانەیان بشكاندایە، دەبوو چاوەرێی سزا بن هەر لەوەی كە سانسۆر بخرێتە سەر ئەو راپۆرتانەی دەیاننووسی تا دەگاتە راگرتنی ئەو رۆژنامانەی ئەو رۆژنامەنووسانە شتی قەدەغەیان تیا بلاو كردووەتەوە.

دوای شەر، یانەكانی چاپگەران هەنگاوێكی تازەیان نا تا لەگەڵ یەكێتی و كۆمەڵەكانی دیكەی رۆژنامەنووسان دۆستایەتیی توند و تۆڵ دروست بكەن، بۆ ئەوەش پەیوەندییان بەهەموو دەزگا و ئاژانسەكانی دەنگوباس و هەواڵدەرانەوە كرد. بەهەر حاڵ دەبوو یانەكانی چاپگەران و میدیا و هەواڵگرەكان هەنگاوی راستەقینە بنێن بۆ ئەوەی خاوەنی خۆیان بن و ببنە بنكە و سێنتەری هەموو جۆرە هەواڵ وەرگرتن و هەواڵ بەخشینێك وا بۆ هەر ئەندامێكی ئەو رێكخراو و دەزگا و رۆژنامەنووسانە هەبێ كەڵك لەو بنكەیە وەربگرن، بۆ هەر هەواڵێكی تازەكە دێت و دەچێ. بۆ نموونە: وەختێ كۆبوونەوە و كۆنفرانسی هاویەش یان هەر راگەیاندنێكی بەبایەخ لە نێو یانەی چاپگەران، بكرێ و بگیرێ، بۆ رۆژنامەنووسەكان زەحمەتە بتوانن دەستیان بگاتە هەموو كار و چالاكییەكانی نێو یانەكان، چونكە ئەوانیش پابەندی كۆمەڵێ رێكەوتن و پەیمانن لەگەڵ ئەو دەزگا و رێكخراوانە كە وایان لێ دەكا، نەپەرژێنە سەر ئەوەی بەهەموو لایەكدا رابكەن تا هەواڵ و دەنگوباس كۆ بكەنەوە.

بۆ ماوەی چەندین ساڵ چەندین گفتوگۆ و دەمەتەقێ لەسەر ئەوە کرا کە هەندێ دژ بەسیستەمەکانی یانەکانی چاپگەران بوون. هەندێکیشیان پشتگیریان دەکرد، بەڵام خاڵە چاکەکانی ئەو سیستەمە و کۆسپ و تەگەرەکانی لە مانەی خوارەوەدا بەرجەستە بوون:

## لایەنە چاکەکانی:

١- سیستەمی یانەی **چاپگەران دەتوانێ** بەردەوام **ڕۆڵی** چاودێری و سەرپەرشتیاری **ببینێ**، هەمیشە **چاوێکی** لەوە **بێ دەسە**ڵاتداران چی دەکەن.

٢- دەتوانێ **وابکات** دەزگا و **ئاژانس و** هەموو **لایەنە هە**واڵدەرەکان بەرێکی **کاری خۆیان** ئەنجام **بدەن.**

٣- **سیفەتێکی تری** ئەو یانانە **ئەوەیە** بوونەتە شوێنێکی زۆرباش بۆ ڕۆشنبیر کردنی ڕۆژنامەن**ووسان** لە ڕێگەی ڕێکخستنی کۆڕ و کۆبوونەوە و پێشکەش کردنی **شیکردنەوە** و سەفەر کردن بەنیازی بینینی **شتی** تازە لە ڕۆژنامەنو**وسان** کەڵکی لێ وەربگرین.

٤- لە ڕوانگەی ئەو کەسانەی کە **زانیاری** بەخشن، سیستەمی یانەی چاپگەران زۆر گونجاوە لەوەدا **کە** دەتوانن هەر هەموو بەیەکەوە، بەیەکەم ژەم زانیاریی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و چاپەمەنی ڕەت بکەنەوە.

## کۆسپ و تەگەرەکانی:

١- ئەم سیستەمە ڕێی خۆش کرد بۆ پەیدابونی جۆرە ڕۆژنامەگەرییەك کە پشت بە گوتەی ئەم و ئەو ببەستێ، پتر پشت بە«بەلاغ» ببەستێ.

٢- بوار خۆش دەکا بۆ زانیاری بەخشەکان، کە بەئاسانی یاری بەو زانیارییانە بکەن کە لایانن و بگرە دەستکاریشیان بکەن.

٣- سیفەتێکی بەهێزی ئەم سیستمە ئەوەیە کە بەسەرخۆیدا داخراوە و سنووردارە، چونکە تاڕادەیەك زۆربەی یانەکانی چاپگەران لە یابان بەتەنیا ئەندامێتیی ئەوانە قبووڵ دەکەن کە ئەندامی ئەو ڕێکخراو و کۆمەڵانەی ڕۆژنامەنووسانن کە لەناو یاباندا هەن، بەڵام هەموو پەیامنێرە بیانییەکان و ڕۆژنامەنووسە سەربەخۆکان کۆتوبەندی زۆریان لەسەرە و بۆیان نییە ئەندامی ئەو یانانە بن، تەنانەت ناتوانن لە نێو کۆنفرانسە ڕۆژنامەگەرییەکاندا بەشدار بن. لە ژێر سایەی سیستمی یانەی چاپگەران مەیلێکی زۆر هەبوو بۆ نزیکبوونەوەی ڕۆژنامەنووسان و بەخشکەرانی زانیاری. وەختێ ڕۆژنامەنووسێك بۆ ماوەیەکی درێژ، وەك ئەندامێکی یانە حسێبی بۆ دەکرێ و مەقامێکی دەبێ، پەیوەندی لەگەڵ لایەنە دەسەڵاتدارەکان تا دێ بەهێزتر دەبێ، ئەوەش وا دەکات کە ڕۆحی ڕەخنەگرانە لای ڕۆژنامەنووسان بکوژرێ. لە خراپترین حاڵەتیشدا لەوەدایە ئەو ڕۆژنامەنووسە ببێ بەوەکیلی بڵاوکردنەوە بۆ دەسەڵاتداران.

پەیامنێرە بیانییەکان لە یابان زۆر بەتوندی ڕەخنەیان لە سیستمی یانەی چاپگەران گرت، داوایان کرد کە «یابان دەبێ سیستمی هەواڵبەخش و هەواڵگری خۆی هەبێ» لەبەر ئەنجامی داوای ئەم ڕۆژنامەنووسە بیانییانە «یەکێتی ڕۆژنامەکانی یابان» یەکڕا و یەکدەنگ گەیشتنە ئەم بڕیارەی خوارەوە:

«دەبێ هەموو جۆرە هاریکارییەکی گونجاو لەگەڵ پەیامنێرە بیانییەکاندا بکرێ و ڕێیان بۆ خۆش بکرێ بۆ ئەوەی بتوانن وەك هەواڵگر سەرکەوتوو بن، تا بەوەش دەگا کە بتوانن لە کۆنفرانسە ڕۆژنامەگەرییەکان بەشدار بن کە لە ژێر سەرپەرشتیی یانەی چاپگەراندا دەبەسترێن.

بەهەر حاڵ هەموو بڕیارێك سەبارەت بە فراوانكردنی هاریكاری لەگەڵ پەیامنێرە بیانییەكاندا دەبێ كاری یانەی چاپگەران بێ، بۆ ئەم مەبەستە پەیامنێرەكان ڕاستەوخۆ گفتوگۆ لەگەڵ یانەكان دەكەن تا ڕێیان بۆ خۆش بكەن دەستیان بگاتە سەرچاوە و دەروازەكانی زانیاری.

یابانییەكان زۆر چاك ئاگاداری ئەو گرفت و كێشانەن كە لە سیستمی یانەی چاپگەراندا هەیە، كەچی ئێستاش لەبەر ئەوەی ئەو یانە پلە و مەقام و دڵنیاییەك بەئەندامانی خۆی دەبەخشێ، بۆیە هیچ ڕۆژنامەنووسێك حەز ناكات لە دەرەوەی سیستمی ئەم یانەیە كار بكا و بێتە دەرێ. بەهەر حاڵ. لە سەروەختێكدا كە ئەو ڕۆژنامەنووسە بیانییانەی لە یابان كار دەكەن، بۆیە زۆر پێویستە كە یانەكانی چاپگەران هەوڵی چارەسەری ئەو گرفت و كێشانە بدەن كە بەزەقی دەركەوتوون و ئاشكران.

## مەودا و ڕادەی گەیشتن بە دەروازەی زانیارییەكان:

مەحزەری دانیشتنەكانی پەرلەمان: بەگشتی سەرجەم دانیشتنەكانی ئەنجومەنی پیران «دایت» لەبەردەم هەواڵگرەكانی تەلەفزیۆندا كراون، وێنەگرتنیش سەربەستە. گەرچی بۆ هەر كۆمیتەیەكی پەرلەمان هەیە كە بە بڕیارێك دانیشتنەكان دابخات و بەنهێنی تەواوی بكات. كاتێ مەسەلەی پرسیار و وەڵامی شایەتەكان لە ئەنجوومەندا، دێتە پێشێ، هەموو جۆرە وێنەگرتنێك قەدەغە دەبێ. ئەوەش لە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیە گەرمەدا بوو كە ئاخۆ ئەنجومەن هەقی ئەوەی هەبووە سەرۆك وەزیرانی ئەوسا «ناكاسۆن» بخاتە قەفەزەوە و پرسیاری مەسەلەی ئەو ئابڕووچوونە گەورەیەی لێ بكا و وەك شایەتێك بیخاتە ژێر گیروگاز. بۆیە هەر وەختێ هەر مەسەلەیەك بگاتە شایەت و شایەتكاری لەناو ئەنجومەندا وێنەگرتن حەرام دەكرێ، ئەوەشیان یاسایەكی بۆ دەرچوو،

مەبەستیش لەم کارە تەنیا پاراستنی مافی ئینسانیی شایەتەکەیە. هەموو ڕێکخراو و کەناڵە جیا و دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەردەوام دژ بەم یاسای حەرامکردنە دەجەنگن.

کۆبوونەوە ڕاوێژکارییەکانی شووراکان و کۆمیتەکانی حکوومەت و نوێنەرانی، وەك مەسەلەیەکی مەبدەئی داخراون. حکوومەتی یابانی و حکومەتە ناوخۆییەکانی تا حاڵی حازر بڕیاری یاسایەکی وەك ئەوەی ئەمریکای نەداوە کە ناویان ناوە «حکوومەت لەبەردەم ڕۆژی ڕووناك»دا واتە بینین و بیستنی هەموو شتەکان.

## مەحزەری دانیشتنەکانی دادگا

ڕۆژنامەنووسەکانیش هەمان مامەڵەی ئەو گوێگر و ئامادەبووانەیان بۆ دەکرێ کە دەیکەنە سەر دادوەرییەکە. بەتایبەتی لەوکاتەی هێشتا دادوەرییەکە بەردەوامە، ناشهێڵن دەنگ تۆمار بکەن، بەڵام ڕێگە بەنوێنەرێکی ڕۆژنامەنووسان دەدرێ بۆ ماوەی سێ دەقیقە ڕەسم بگرێ بەر لە دەست پێکردنی دانیشتنەکانی دادوەرییەکە. ڕۆژنامەنووسان کورسیی تایبەتیشیان لەناو هۆڵی دادگا هەیە.

سەفەر و ڤیزا:- هیچ جۆرە کۆتوبەندێك نییە و ڕۆژنامەنووسان سەربەستن چ بۆ ناو وڵات چ بۆ دەرەوە، سەفەر بکەن، مادامەکی گوێڕایەڵی یاسا و پەیمانەکانن.

## ڕاپۆرتی چوارەم: مالیزیا

دانیشتووان: ١٧.٠٠٠.٠٠٠

ڕێژەی خوێندەواری: ٨٠٪

ڕادیۆ: دانەیەك بۆ هەر (٢.٤) کەسێك

تەلەفزیۆن: بۆ هەر (١٠) کەسێك

ڕۆژنامەکان: (٤٠)

بڵاوکراوە وەرزییەکان: (١.٦٣١)

• هیچ جۆرە پەیمانێکی ڕامیاری و مەدەنی لەگەڵ (UN) مۆر نەکراوە.

هیچ یاسایەکی سەربەستیی زانین لە مالیزیادا، نییە «بگرە یاسای نهێنییە ڕەسمییەکان»ی ساڵی ١٩٧٢بەبەندێکی تازە کە نیشانەی Aی دراوەتێ لە ساڵی ١٩٨٤ پتر مەودای ئەو سەربەستییەی کەم کردووەتەوە، وای کردووە کە بۆ ڕۆژنامەنووسان حەرام بێت ناوی سەرچاوە ڕەسمییەکان بێنن بە لەبەرچاوگرتنی هەموو زانیارییەکی قەدەغەکراو.

بەم شێوەیە سەرچاوە ڕەسمییەکان هەمیشە لەوە دەترسێن ئاشکرا بن، ئەوەش وادەکات لە زانیاری بەخشین بە ڕۆژنامەنووسەکان سڵ بکەنەوە؛ چونکە بەپێی بەندی ژمارە (٨)ی بڕیاری ژمارە یەك لەوانەیە حەوت ساڵ بەند بکرێ یان دەبێت دە هەزار دۆلار سزای ئەو کەس و لایەنە بێ کە ئەم زانیارییانەی پەرت کردووە.

بەپێی بەندی ژمارە (١٩)ی (ڕاپۆرتی جیهانی) ساڵی (١٩٩١)- یاسای نهێنییە ڕەسمییەکان، لە ساڵی ١٩٨٦دا، ئاڵوگۆڕی بەسەر هات، بەپێی ئەم دەستکارییە تازەیە پۆلبەندی و خشتەکاریی بەڵگەنامە حکوومییەکان فراوانتر کراو هەموو بەرپرسیارییەکی خستە ئەستۆی ڕۆژنامەنووسان کە بەر لە بڵاوبوونەوەی هەر زانیارییەك مەرجە بیسەلمێنێ کە هیچ

نهێنییەکی ئەوتۆی تیا نییە. ئەو بڕیارە ڕێی لە ڕۆژنامەنووسان گرت، دەست لە کاروباری «کەرتی گشتیی»، وەربدەن هەتا گەر مەسەلەکە لێکۆڵینەوەش بێ لەسەر کەموکوڕیی ئەو کەرتە. هەر کاتێ ڕۆژنامەنووسان ئەم یاسایە پێشێل بکەن، دەبێ چاوەڕێی ئەوە بن، بەسزای پێنج ساڵ زیندانی یان غەرامەی بیست هەزار دۆلار ڕازی بن. بەگوێرەی بەشی حەوتەم لەو بەندە.

بەندی ژمارە (١٩) وا سەیری «یاسای ئاسایشی ناوخۆی»ی ساڵی ١٩٦٠ دەکا کە بەڕاستی لەبەردەم سەربەستیی چاپەمەنی و سەربەستیی ڕادەربڕین ڕێگەگر بێت.

یاسایەکی کۆنی سەردەمی کۆلۆنیالی بەریتانیا لە مالیزیا-دا ماوە کە ئەو سەردەمە (ISA) کەڵکی لێ وەردەگرت بۆ سەرکوتکردنی هەر بیرو بۆچوونێکی دژ بەسیاسەتی بەریتانیا، خنکاندنی هەر دەنگێکی ناڕەزایی لە بواری سیاسەتدا. ئەم یاسا کۆن و جێماوە، دەسەڵاتێکی بێ سنوور بەحکوومەت دەبەخشێ، بەناوی پاراستنی ئاسایشی دەوڵەت، دەزگایەکی تایبەتی حکوومەتی مالیزی، کەڵك لەم یاسایە وەردەگرێ بۆ کۆمەڵێ چالاکیی جیاواز، هەر لە چاودێری و سەرپەرشتی کردن و سانسۆر خستنە سەر هێڵی تەلەفۆن و سەغڵەت کردنی هەر کەس و لایەنێك کە گومانی لێ بکرێ تێکدەری ئاسایشە. بەم پێیە حکوومەت چوارچاو دەبێ، ئاگای لە ورد و درشتی شتەکان دەبێ.

لە ژێر بەشی (٧٣)ی ئەو بڕیارەدا وەزیری کاروباری ناوخۆ بۆی هەیە فەرمان دەربکات هەر کەسێك بۆ ماوەی شەست ڕۆژ بەمەبەستی لێکۆڵینەوە بەمەرجێ گومان لەو کەسە بکرێ جا چ نێر و چ مێ، شوعبەیەکی تایبەت لە وەزارەت بەم کارە هەڵدەستێت. بەمەرجێك ئەو ئافرەتە یان ئەو پیاوە هەر کارێکی نابەجێی ئەنجام دابێ یان نیازی بووبێ ئەنجامی بدات کە دژ بەسیاسەتی مالیزیا بێ. یان هەر

داو دەزگایەکی حکوومەتی «ڕۆژنامەنووسەکان هیچ حەقێکیان نییە دەستیان بگاتە بەڵگەنامە حکوومییەکان و بگرە هیچ ڕێوڕەسمێکیش بۆ ئامادەبوون لە مەحزەری دانیشتنی لایەنە دەسەڵاتدارەکان حسێبی بۆ نەکراوە. بەڵام بۆ دانیشتنەکانی پەرلەمان هیچ کۆتوبەندێکی بۆ دانەنراوە، دەکرێ ئامادەبن و ڕاپۆرتی خۆیان لەسەر مەحزەرەکان هەبێ. بەهەر حاڵ ڕێکخراو و لایەنە هەواڵگرەکان، دەبێ پێشتر داخوازییەك پێشکەش بکەن تا لۆجی تایبەتییان لەنێو هۆڵی پەرلەماندا بۆ بگیرێ.

سەبارەت بەهەر مەسەلەیەك کە بۆ ڕای گشتی گرنگ بێت کۆسپ و تەگەرە نییە و دەکرێ ئاگای لە هەموو جۆرە لێکۆڵینەوە و مەحزەرێکی دانیشتن بێت، بەدەر لەو حاڵەتانەی کە ئەگەر لایەنە حکوومی و مەدەنییەکان مەبەستیان بێ دەرگا لەسەر خۆیان دابخەن و کەس بەمەحزەری دانیشتنەکان نەزانێ.

## گەیشتن بەمەحزەری دانیشتنەکانی نێو دادگا

ڕۆژنامەنووسان سەربەستن لەوەی ئامادە بن و ڕاپۆرتیان لەسەر مەحزەری دانیشتنەکانی نێو دادگا هەبێت، تەنیا لە حاڵەتێکدا نەبێ کە دادوەرییەکە پەیوەندیی بەخراپکردنی کچانەوە یان منداڵانەوە هەبێ کە دادگا مەبەستی بێ بەنهێنی ئەنجامی بدات.

ڕۆژنامەنووسان سەربەستن لەوەی هەرچییەکی لە داداگادا دەوترێ ڕاپۆرتی خۆیان لەسەر بنووسن، بەڵام نە زیاد و نە کەم، گەر وا نەبێ ئەو ڕۆژنامەنووسە دەبێ چاوەڕێی ئەوە بکات کە دادگا ڕێزی لێ نەگرێ و بەر شکایەتیش بکەوێت.

هیچ شتێك حەرام نییە تەنها ئەوە نەبێت کە ئاشکرا کردنی ناوی ئابڕوو و ئەتك کراوەکان قەدەغەیە.

سەفەر و ڤیزا: هیچ کۆت و بەندێکی لەسەر نییە.

## ڕاپۆرتی پێنجەم: پیرۆ

دانیشتووان: ٢.٩٠٠.٠٠٠

ڕێژەی خوێندەواری: ٨٥٪

ڕادیۆ: دانەیەك بۆ هەر (٤.٩) کەسێك.

تەلەفزیۆن: دانەیەك بۆ هەر (١٣) کەس.

ڕۆژنامەکان: (٧٠)

بڵاوکراوە وەرزییەکان: ٥.٠٧

• ساڵی مۆرکردنی پەیمانی مەدەنی و ڕامیاری لەگەڵ (UN) ١٩٧٨ دەستووری پیرۆ ئەوەی سەلماندووە «کە هەموو کەسێك هەقی سەربەستیی زانینی هەیە، هەقی ڕا دەربڕین، بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی تایبەت بەخۆی لە ڕێگەی نووسین و قسەوە. بەبێ مۆڵەت لە کەس وەربگیرێت، بێ سانسۆر، بێ کۆسپ و تەگەرە خستنە بەردەم، بەمەرجێ لە سنووری یاسا لانەدات»

بڕیاری ژمارە (٢٠)- بەندی چوارەم

بەهەر حاڵ لە پیرۆدا تەشریعاتی تایبەت بە «حەقی زانین» نییە، یان بۆ وەدەستهێنانی و گەیشتن بەبەڵگەنامە ڕەسمییەکان.

لە دەستووری مەدەنی تازەدا کە لە ٣ی نیسانی ١٩٩١ەوە کاری پێ دەکرێ، لە بەندی ژمارە (١٦١، ١٦٤، ١٦٢) ژمارەیەك لە کۆتویەندی داناوە سەبارەت بەڕاپۆرت نووسین لەسەر لایەنە دەسەڵاتدارەکان.

بەڵام گەر هیچ کۆسپێك لەبەردەم هەواڵگرەکاندا نەبێ کە ئاگاداری مەحزەری دانیشتنەکانی پەرلەمان بن، ئەوە مەرجە بزانرێ گەیشتن بەدۆسیەی ئەو حیزبانەی کە لە ململانێدان زۆر زەحمەتە.

هەمان پرنسیپ سەبارەت بەدانیشتنەکانی نێو دادگاش ڕاستە، هەقی ئامادەبوون و ڕاپۆرت نووسین سەبارەت بەدادوەرییە گشتییەکان سنووردارە، دیدەنی و دواندنی ئەو کەسانەی کە لە کێشە و مەسەلەیەکی دادگایی ئاڵاون قەدەغەیە.

مەسەلەکە بۆ ڕۆژنامەنووسانی پیرۆز دیوێکی یاسایی نییە کە حەرام و حەڵاڵیان بۆ لێك جیا بکاتەوە، بەڵکو ترسەکە لەوەدایە کە هەڕەشەی مەرگیان لێ دەکرێ هەر وەختێ بەڕاستی وێڵی گەڕان بەدوای زانیاریدا بن، تەنیا لە وەختی زۆر پێویستدا ئەو کۆتوبەندە لەسەر زانیاری دادەنرێ.

سەرەڕای ئەوەش هەقی سەفەر لەنێو وڵاتیشدا کۆتوبەندی لەسەرە، ڕۆژنامەنووسان تووشی تۆقاندن و سەغڵەتکردن و کوشتن دەبن. بگرە هەندێ جار هەر یەکێ لەلایەنە یان پارتە شەڕکەرەکان بۆی بکرێ بزریان دەکات. بەتایبەتی لە وەختی ململانێی چەکدارانەدا.

## ڕاپۆرتی شەشەم: سینیگال

دانیشتوان: ٧.٧٤٠.٠٠٠

ڕێژەی خوێندەواری: ٣٨٪

ڕادیۆ: دانەیەك بۆ (٨.٧) کەس

تەلەفزیۆن: دانەیەك بۆ هەر (٣١) کەس

ڕۆژنامە: (١)

بڵاوکراوە وەرزییەکان: (٥)

- ساڵی مۆرکردنی پەیمانی ڕامیاری و مەدەنی لەگەڵ (UN)– ١٩٧٨
- هیچ یاسایەکی سەربەستیی زانین لە سێنیگالدا نییە، بەڵام چەند دەقێکی یاساییش هەیە کە ببێ بە پەیڕەو و پرۆگرام بۆ کارکردنی ڕۆژنامەنووسان. دەستووری سێنیگال بەڕەسمی سەربەستیی ڕادەربڕینی سەلماندووە و لەم بوارەدا ئاماژەی بۆ جاڕی گەردوونیی بۆ مافەکانی مرۆڤ کردووە. سێنیگال چەندەها پەیمان و ڕێککەوتنی سەبارەت بەمافەکانی مرۆڤ مۆر کردووە. یەکێ لەوانە ڕێککەوتنە لەسەر دەستووری ئەفریقی.

یاسای چاپەمەنییەکانی نەورۆزی ١٩٧٩ بەشێوەیەکی زۆر سەرکوتکەرانە و لە ١٩٨٦دا ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات کە تیایدا بەتەنیا باس لە ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووسان دەکا نەك ماف و هەقەکان.

هەنووکە دوو دەقی یاسایی ماون کە کاریان پێ دەکرێ و خێریان تیایە کە هەردووکیان لە ساڵی ١٩٩١ەوە عەمەلیان پێ دەکرێ.

هیچ یاسایەك نییە کە ڕێگە بۆ ڕۆژنامەنووس خۆش بکا دەستی بگاتە دۆکیومێنتەکان. خۆ ئەگەر لە ڕێگەی فروفێڵی خۆیەوە توانیی دەست بەسەر هەندێ بەڵگەنامەی وادا بگرێ کە زانیاری بەبایەخ و تاڕادەیەك

حەساسیان تیابێ، لەم حاڵەتەدا نائیبی گشتی بۆی هەیە، وا لە ڕۆژنامەنووسەکە بکات کە ناوی سەرچاوەکانی زانیاری ڕابگەیەنێ.

لە سینیگال هیچ یاسایەك سەبارەت بەنهێنییە ڕەسمییەکان، دانەڕێژراوە، بەڵام بەگشتی هەر بەڵگەنامەیەك کە هێشتا لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە بڵاو نەکرابێتەوە. بەهەر حاڵ لە ئەنجامی پەیدابوونی ڕۆژنامەگەریی سەربەست هەندێ بەڵگەنامەی نهێنی بڵاو کرانەوە بێ ئەوەی دەوڵەت هیچ کاردانەوەیەکی هەبێ.

## گەیشتن بەمەحزەری دانیشتنەکانی پەرلەمان

لە چەند حاڵەتێکی زۆر کەمدا پەرلەمان بەئاشکرا ڕێ لە دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە دەگرێ، تەسریحات و قسەی نوێنەران یان وەزیرەکان بگوێزرێنەوە دەرەوە.

## گەیشتن بە مەحزەری دانیشتنەکانی دادگا

بەگشتی ڕێ بەڕۆژنامەنووسەکان دەدرێ بەشداریی دانیشتنەکانی نێو دادگاکان بکەن و ڕاپۆرتی خۆشیان لەسەر کەینوبەین و ڕووداوەکان بنووسن. بەهەر حاڵ وێنەگرتن بەکامێرای ڤیدیۆ و تۆمارکردنی دەنگ لەنێو هۆڵی دادگادا قەدەغەن، هەتا گەر کێشەکانیش گشتگیر بن، چ حکوومی و چ مەدەنی، گفتوگۆ و دادوەرییەکان لەنێو هۆڵەکە ناچنە دەرێ.

سەفەر و ڤیزا: هیچ کۆتوبەندێکی یاسایی لەبەردەم ڕۆژنامەنووساندا نییە، گەر نیازی سەفەر بۆ ئیش و کاری ڕۆژنامەگەری بێ، بۆیان هەیە چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوە سەفەر بکەن.

## ڕاپۆرتی حەوتەم: مەملەکەتە یەکگرتووەکان (بەریتانیا)

**دانیشتوان:** ٥٧.١٢١.٠٠٠

**ڕێژەی خوێندەواری:** ٩٩٪

**ڕادیۆ:** دانەیەك بۆ یەك كەس

**تەلەفزیۆن:** دانەیەك بۆ سێ كەس

**ڕۆژنامەكان:** (١٢٤)

**بڵاوكراوە وەرزییەكان:** (٦.٤٠٨)

**ساڵی مۆر كردنی پەیمانی ڕامیاری و مەدەنی لەگەڵ (UN) ١٩٧٦**

• هیچ یاسایەكی گشتی بۆ سەربەستیی زانین نییە، بەڵام یاسایەك بۆ نهێنییە ڕەسمییەكان هەیە كە لە ڕادە بەدەر توند و تیژە. زۆربەی بەڵگەنامە و نووسراوە حكوومەتییەكان دەكرێ دوای سی ٣٠ ساڵ بڵاو بكرێنەوە، هەندێ جار ئەو ماوەیە درێژتر دەبێتەوە و دەگاتە سەد ساڵ. بۆ نموونە نووسراوەكانی وەزارەتی ناوخۆ كە لەسەردەم جەنگەوە و دەست بەسەرداگرتنی پێشەوای فاشی «ئۆزوالد مۆسلی» تا هەنووكەش بەناوی پاراستنی ئاسایشەوە هەر بەنهێنی پارێزراون.

سەبارەت بەگەیشتن بەزانیاری لەلایەن حكوومەتی ناوخۆیی مەسەلەكە گەر بەكەمیش بێ چەند هەنگاوێك چووە پێشێ، بۆ ئەم بوارەش لە ساڵی ١٩٨٥دا بڕیارێك دەرچوو كە زیاتر مەودای گەیشتن بەكۆبوونەوەكانی ئەنجومەنی ناوخۆ و ڕاپۆرتەكان و بەڵگەنامەكان ئاسانتر بكات، سەرەڕای یاسای گەیشتن بەتۆمارەكانی تەندروستی ١٩٩٠ یاسای گەیشتن بەتۆمارەكانی نوشداری ١٩٨٨. بڕیاری گەیشتن بەفایلە تایبەتی و شەخسییەكان ١٩٨٧.

یاسای نوێی نهێنییە ڕەسمییەكان لە یەكی ئاداری ١٩٩٠ ئیشی پێ كرا

که‌له‌ بری به‌شی دووه‌می یاسای نهێنییه‌ ڕه‌سمییه‌کان ساڵی ١٩١١ دانرا. **به‌گوێره‌ی** ڕاپۆرتی جیهانی ساڵی ١٩٩١.

به‌ندی ژماره‌ (١٩):

«یاسای نوێ به‌ته‌واوی پێی له‌سه‌ر پاراستنی چوار جۆر زانیاری داگرتووه‌: ئه‌و زانیارییه‌ی حکوومه‌ت له‌ بواری به‌رگریدا به‌زه‌ره‌ری ده‌زانێ گه‌ر په‌رت بێ، ئه‌و زانیارییه‌ی به‌متمانه‌وه‌ به‌ده‌وڵه‌ته‌کانی دیکه‌ یان ڕێکخراوه‌ جیهانییه‌کان به‌خشراوه‌، ئه‌و زانیارییه‌ی په‌یوه‌ندیی به‌چالاکییه‌کانی ئاسایشه‌وه‌ یان ئیستیخباراته‌وه‌ هه‌یه‌. له‌گه‌ڵ زانیاری سه‌باره‌ت به‌هه‌ر په‌یوه‌ندییه‌کی نێو ده‌وڵه‌تانی دونیا»

شکاندنی هه‌ر یه‌کێ له‌م بڕیارانه‌ و خۆ گێلکردن له‌ شته‌ قه‌ده‌غه‌کراوه‌کان وا ده‌کا سزای گه‌وره‌ فه‌رمانبه‌ره‌ حکوومییه‌کان بگرێته‌وه‌ که‌ داوایان لێ ده‌کرێ، دانه‌یه‌ك له‌و یاسایه‌ مۆر بکه‌ن و به‌رده‌وامیش له‌ ئاکامه‌کانی ئاگادار بکرێنه‌وه‌، به‌تایبه‌تی له‌ بواری مه‌ترسی به‌خشینی زانیاری، به‌پله‌ی یه‌که‌م، به‌ڵام بۆ کۆتوبه‌ند خستنه‌ سه‌ر زانیارییه‌ ڕه‌سمییه‌کان، گفتوگۆی له‌سه‌ر نییه‌، به‌م پێیه‌ هه‌ر شتێك که‌ حکوومه‌ت حیسابی نهێنیی بۆ بکات، نابێ په‌رده‌ی له‌سه‌ر لابدرێ.

له‌ مه‌یدانی «ئاسایشی نه‌ته‌وه‌یی»شدا چه‌ند مه‌سه‌له‌یه‌ك هه‌ن که‌ حسێبی وردیان بۆ ده‌کرێ له‌وانه‌ش په‌یوه‌ندییه‌ ده‌ره‌کییه‌کان.

ئه‌و ڕۆژنامه‌نووسانه‌ی که‌ ئه‌م یاسایه‌ ده‌شکێنن، قورسترین سزا که‌ به‌ریان بکه‌وێ چوارده‌ ساڵ زیندانی کردنه‌. به‌هه‌ر حاڵ تا هه‌نووکه‌ هیچ ڕۆژنامه‌نووسێك نه‌گیراوه‌. پێشێلکردنی یاسا و بڕیاره‌کانیش هه‌ر بووه‌، به‌ڵام ئاکامه‌که‌ی دوو دیوی هه‌بووه‌، یان ئه‌وه‌تا فه‌رامۆش کراوه‌، یان زۆربه‌ی کات ئه‌و که‌سه‌ی که‌ یه‌که‌مجار زانیارییه‌که‌ی په‌رت کردووه‌، زیندانی کراوه‌.

**گەیشتن بەبەڵگەنامە حکوومییەکان:** بڵاوکردنەوی زانیاری بەتەواوی پابەندە بەئارەزووی حکوومەتەوە. هەندێ تۆمار و نووسراوی حکوومەتی هەن (هی کۆمپانیاکان، سەرژمێریی دانیشتووان... هتد) کە شیاوی ئەوەن هەموو کەس بیانبینێ و بیانپشکنێ. ڕۆژنامەنووسان هیچ مافێکی تایبەتییان لەم بوارەدا نییە.

هەندێ لە ڕۆژنامەنووسان سەبارەت بە کێشەکانی پەیوەندیدار بەبەریتانیاوە زانیارییان لەو وڵاتانەدا دەستگیر دەبێ کە لە ڕووی یاساییەوە نەرمونیانترن کە هەرگیز لەسەر بڵاو کردنەوەی زانیاری کەس نابرێتە بەردەمی دادگا.

ئەوانەی کە خۆ بەزمانحاڵ و نوێنەرانی حکوومەت دەزانن، بۆیان هەیە کە هیچ بەڵگەنامەیەك نەدەن بەکەس و وەڵامی هیچ پرسیارێکیش نەدەنەوە، لە یاسای ئینگلیزیدا باس لە هیچ مەرجەعییەتێك نەکراوە کە ڕۆژنامەنووسان پشتی پێ ببەستن، ئەوانیش هەروەکو خەڵکی تر هەمان ماف و هەمان کۆتوبەندی یاسایی دەیانگرێتەوە. ئەم حاڵەتە سەبارەت بەهەموو مەیدانەکانی دیکەش هەروایە (گەرچی کۆمەڵێ کۆتوبەند لەسەر ئەو ڕاپۆرتانە هەیە کە لە دادگاوە دەردەچن).

## گەیشتن بەمەحزەری دانیشتنەکانی لایەنە دەسەڵاتدارەکانی حکوومەت:

بڕیارەکانی حکوومەتی ناوخۆیی کردوویەتی بەمەرج کە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی ناوخۆ و شووراکان و هەندێ لە کۆمیتەکان کراوە بن، بەڵام بۆ هەندێ مەسەلەی پڕ لە نهێنی و متمانە دەکرێ دانیشتنەکان داخراو بن.

هەمان شت سەبارەت بەدەستە و تاقمە مەدەنییەکانیش ڕاستە، بڕیاری تایبەت بەوەی کە بۆیان هەیە لە کۆبوونەوەکان ئامادە بن لە ساڵی ۱۹٦۰ەوە ئیشی پێ کراوە، هەندێ لایەنی دەستەڵاتە بچووکەکانی

حکوومەتی ناوخۆ و دەزگاکانی تەندروستیش هەمان هەقیان هەیە، بەڵام ئەو دەزگایانەی لە پێکهاتەیەکی نوێدا و لەژێر ناوێکی تازەدا «خزمەتگوزاریی تەندروستیی نیشتمانی»دا ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات، وای لێ هات لە دەستە و تاقمی تازەدا حوکمی خۆیان بکەن (خەستەخانەکان، کۆمەڵە تەندروستییەکان) ئەو هەقەشیان وەرگرت کە بتوانن خەڵکی لەوە دوور بخەنەوە دەست لە کاروباریان وەربدەن. سەبارەت بەهەواڵگرتن لە مەیدانی حەقیقەتە رامیاری و مەدەنییەکان هیچ یاسایەکی دیاریکراو دانەرێژراوە، بەڵام هەنووکە یاسایەکی نهێنی هەیە بۆ خۆ پاراستن کە دەکرێ بڵێین یاسایەکی نوێیە و پارێزگاری لە زانیارییەکان دەکا، بەتەقەتی بمێننەوە. لەلایەن «کۆمسیۆنی لێکۆڵینەوە»وە پەسەند کراوە، بەڵام تا هەنووکە کاری پێ نەکراوە.

## گەیشتن بە مەحزەری دانیشتنەکانی پەرلەمان

مەحزەری دانیشتنەکان چ لەناو پەرلەمان و چ هی کۆمیتەکان کراوەن، بەڵام گەیشتن بەهەموو زانیارییەکان هەتا بۆ رۆژنامەنووسە مۆڵەت پێدراوەکانیش سنووری بۆ دانراوە، هەمان شت سەبارەت بەبڵاوکەرەوەکان. تەنیا بۆ ئەندامەکانی «لۆبی»ی پەرلەمان هەیە کە لە مەحزەری دانیشتنەکانی نێو پەرلەمان ئاگادار بن، هەتا بۆیان هەیە بچنە نێو ئەو بەشانەی کە لەبەردەم رۆژنامەنووسان و خەڵکی عەوام داخراون، بۆیان هەیە پێشتر چەندەها کۆپییان لە نووسراوە رەسمییەکان دەست بکەوێ، بەمەرجێ تا ئەو وەختەی بەرەسمی بڵاو دەبنەوە، بەنهێنی هەڵگیرێن.

سەبارەت بەمەحزەرەکان دەکرێ راپۆرت لەسەر هەردوو مەحزەرەکان هەبێ، هەموو جۆرە ئیفترا و درۆ هەڵبەستنێ رەوا نییە. بەڵام هەندێ مەسەلەی پەیوەندیدار بە «ئاسایشی نیشتمانی» داخراون.

## گەیشتن بەمەحزەرەکانی دادگا

مەبدەئێکی گشتیی و قبوولکراو هەیە کە دەڵێ: هەموو دادگاکان کراوەن. بەهەر حاڵ هەندێ کۆتوبەندیشی لەسەرە:

١- لە هەندێ حاڵەت دادگاکان حەز دەکەن نهێنییەکان بپارێزن، بەتایبەتی کە مەسەلەکان پەیوەندییان بەنهێنییە رەسمییەکانەوە هەبووبێ، یان گەر شایەتێك نەیتوانیبێ بەئاشکرا دەربکەوێ.

٢- لە نێو هۆڵی دادگاکانی نەوجەوانان زۆربەی دادوەرییەکان داخراون. بەتایبەتی وەختێ مناڵان شایەتی دەدەن.

جیاوازیش لە نێوان ئامادەبوونی نێو دادگاکان و راپۆرتنووسین لەسەر رووداوەکان هەیە. لە دادوەرییەکانی سوێند خۆران هەرچییەکی لە غیابی سوێند خۆران دەوترێ زەحمەتە دووبارە بکرێتەوە. سەبارەت بە مەحزەرەکانی کۆمیتە لە دادگای تاوان کۆمەڵێ سنوور بەندی یاسایی هەن کە ناهێڵن هیچ راپۆرتێك بڵاو بکرێتەوە، گەر تەئسیری لەسەر سروشتی دادوەرییەکان هەبێ. چونکە ترسی ئەوە هەیە بەر لە کۆتایی دادوەرییەکە، تەئسیری سەلبیی خۆی بکاتە سەر ماجەرای رووداوەکان، هیچ شتێك سەبارەت بەو تاوانبارەی چاوەڕێی دادگاییکردنە بڵاو نابێتەوە؛ چونکە ئەوەشیان کار دەکاتە سەر جۆری بەرگریکردنەکە.

لەسەر کێشە و مەسەلە مەدەنییەکان، کارەکە بەجۆرێکی ترە. هەر وەختێ رۆژنامەنووس سووکایەتی بەدادگا بکات و یاسا بشکێنێ، دەبێ چاوەڕێی سزا بێ کە جارویار ڕوو دەدا و پارەی باشی لێ وەردەگیرێ.

مەحزەرەکانی نێو دادگاش وەکو هی پەرلەمان حسێب و کتێبی لەسەرە، بەڵام هەرچییەکی بەئاشکرا دەگوترێ دەکرێ راپۆرتی لەسەر بنووسرێ.

سەفەر و ڤیزا: نییە.

## ڕاپۆرتی هەشتەم؛ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

دانیشتووان: ٢٥٠.٣٧٠.٠٠٠

ڕێژی خوێندەواری: ٩٩٪

ڕادیۆ: دانەیەك بۆ (٠.٥) کەس

تەلەفزیۆن: دانەیەك بۆ (١.١) کەس

ڕۆژنامەکان: ١.٦٤٢

بڵاوکراوە وەرزییەکان: ٥٩.٦٠٩

هیچ ڕێکەوتننێکی **مەدەنی** و ڕامیاری **لەگەڵ** (UN) ئیقرار نەکراوە.

لە ساڵی **١٩٦٦ەوە** «یاسای سەربە**ستی** زانین» عەمەلی پێ دەکرێ، سیاسەتێکیان گرتە بەر کە لە بەرژەوەندی پەردەلادان بوو لەسەر هەموو حەقیقەت و زانیارییەکان. هەموو کەسێك هەقی خۆیەتی داوای بەڵگەنامەکان بکات.

بەهەر حاڵ سەبارەت بەو زانیاریانەی کە حکوومەت دەیاندا بەم و بەو، هەر ئاوا ڕەمەکی نییە و کۆمەڵێ کۆتوبەندیان لەسەرە. ئەو دۆکیومێنتانەی کە پەیوەندییان بە ئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە، بە سیاسەتی دەرەکی، باج، داتای سەرژمێرییەکان، زانیارییەك بخرێتە بەردەم دەستەی باڵای سوێند خۆران، **ڤیزا** هەر زانیارییەك کە لە ئاکامی دانووسان دەست کەوتووە، سەبارەت بەدۆزینەوەی هێڵی ئاسمانیی نێو دەوڵەتان، زانیاری سەبارەت بەو ڕاپۆرتانەی کە پەیوەندییان بەدیل و بەندییەکانەوە هەیە کە لەسەر بەڵێنێك ئازاد دەکرێن، هەر تۆمارێك کە پەیوەندیدارە بە شتە هەرە تایبەتی و کەسایەتیی تاوانبارەکان، ئەو زانیاریانەی کە لای کۆمسیۆنی سەلامەتی بەرهەمهێنانە، نهێنییەکانی نێو دونیای بازرگانی، پەیوەندییە ناوەکییەکان، هەموو فایلە

پەیوەندیدارەکانی نوشداری، هەر زانیارییەك سەبارەت بەرێکخستنی کارویاری نێو دەزگا داراییەکان، بەیانات و زانیاری سەبارەت بەبیرەکانی نەوت...هتد لە هەموو ئەم حاڵەتانە بەخشینی زانیاری و پەردەلادان لەسەر ورد و درشتی شتەکان حسێب و کتێبی هەیە، تا دەگاتە رادەی لێ هەڵاوێردی. بڕیاری تایبەت بەپاراستنی نهێنیی تاکە کەس لە ناواخنی ئەو یاسایانەدا ئیعتیباری هەیە.

بەندەکانی بڕیاری سەربەستیی زانین کۆنگرێس ناگرێتەوە، چونکە ئەندامانی کۆنگرێس بوارێکی سنووردار بۆ خەڵك و چاپەمەنییەکان دەهێڵنەوە و گەیشتن بەتۆمار و نووسراوەکانی خۆیان سەخت و زەحمەتتر دەکەن.

لە ساڵی ١٩٧٦دا حکوومەت لەژێر سێبەری «هەقی زانین»دا، بڕیارێکی دەرکرد کە ناوی «میری لەژێر تیشکی ڕۆژی ڕووناکدا» بوو بەو پێیەی کە «جەماوەر هەقی تەواوی خۆیەتی هەموو زانیارییەکی پێویستی دەست کەوێ کە پەیوەندیی بە مەسەلە چارەنووسسازەکانی حکوومەتی فیدراڵییەوە هەبێ» بۆ ئەوەش دەبوو پەنجا نوێنەر و وەکیلی فیدراڵ لە کۆبوونەوە کراوەکاندا گفتوگۆ بکەن، بەئامادە بوونی کۆمیسیۆنی ئاسایش، بانق و بۆرسەکان، دەزگای خزمەتگوزاری پۆستەخانەی ئەمریکی، کۆمیسیۆنی سەلامەتیی ئەو بەرهەمانەی بەخەڵکی دەفرۆشرێن.

بەڵام ئەو بڕیارەش «میری لەژێر تیشکی ڕۆژی ڕووناکدا»، بەعەمەلی بازنەی کارکردنی بەرتەسك بووەوە. نوێنەران و وەکیلەکانی حکوومەتە فیدراڵییەکان بەبڕوبیانووی جیاوازەوە یەك لەسەر سێی مەحزەری دانیشتنەکان قوفڵن.

لە ولاتە یەکگرتووەکاندا هیچ یاسایەکی نهێنییە ڕەسمییەکان لە ئارادا

نییە، بەڵام ئەوەش وا ناگەیەنێ کە حکوومەت هیچ نهێنییەکی نەبێ، ژمارەیەك لە فەرمانی وا دەرچوون کە گەیشتن بەزانیاری قەدەغە بکەن. بەتایبەتی ئەو زانیاریانەی کە سیفەتی «نهێنی»یان دراوەتێ، یاسای پۆلبەندی و خشتەکاریی زانیارییەکی تەکنیکی و زانستییەکان لە ژورناڵە تایبەتمەندییەکان (ئەو ڕۆژنامانەی کە هی دانا و زاناکانن) کۆتویەندی قورسیان خرایە سەر و پتر کۆنتڕۆڵ کران، هەمان شتیش سەبارەت بەکۆنفرانسە پیشەگەرییەکان ڕاستە. بەڵێن لە فەرمانبەرە حکوومییەکان (مەدەنییەکان) وەرگیراوە کە نهێنی بپارێزن، بەگوێرەی بەندی ژمارە (١٩) بەتوندی سنوور و بازنەی گەیشتن بەزانیارییەکان بۆ ئەندامانی کۆنگرێس و خەڵکی تەسکتر کراوەتەوە، سەرەڕای کەمکردنەوەی دەسەڵاتی چاودێرانەی کۆنگرێس.

## گەیشتن بە بەڵگەنامە حکوومییەکان

جیا لە بڕیاری سەربەستیی زانین، کە بوار بۆ ئەو گەیشتنە خۆش دەکات، ئەمریکا یاسای تایبەتی دارشتووە کە هەموو تۆمارکراو و نووسراو و مەحزەرەکان، بەپێی ئەو یاسایە، کراوەن، بەڵام ئەم یاسایانەش وەك یاساکانی فیدراڵی چەند هەڵاوێردنێکی تێدان.

## گەیشتن بە مەحزەری دانیشتنەکانی لایەنە دەسەڵاتدارەکان

وڵاتە یەکگرتووەکان یاسای تایبەتیی هەیە کە بڕوا دێنێ بەکردنەوەی هەموو کۆبوونەوەکان کە تیایدا بۆ ڕۆژنامە و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و خەڵکی ڕەوایە لەو خولی دانیشتنانەدا ئامادە بن، بەتایبەتی خولەکانی هەیئەتە حکوومییەکان. دیسانەوە هەڵاوێردنیان تێدایە.

لەژێر چەتری دەستەبەرکردنی متمانەیەکی دەستووری بۆ سەربەستیی قسەکردن و چاپەمەنی، ڕۆژنامەنووسان سەربەستن ڕاپۆرتی خۆیان

هەبێ سەبارەت بەهەموو وتە و کردارەکانی کارمەند و فەرمامبەرانی میری، بەڵام بۆ هەموو پەیمان شکاندنێك یاسا لێیان دەپێچێتەوە.

## گەیشتن بە مەحزەری دانیشتنەکانی پەرلەمان

هیچ کۆتوبەندێك لەبەردەم رۆژنامەنووساندا نییە بۆ گەیشتن بەمەحزەری دانیشتنە رەسمییەکان و ئامادە کردنی راپۆرت لەسەر ئەو مەحزەرانە، جا چ هی کۆشك بێ و چ هی سیناتۆرەکان. بەڵام بۆ دانیشتن لەنێو «لۆجی رۆژنامەنووسان» لە کۆنگرێسدا دەبێ بەڵگەنامەی باوەڕ پێکراو پیشان بدەن کە لەلایەن هەموو ئەندامەکانەوە هەڵبژێردراون، بۆ ئەوەش حساب و پێوانەیەك دانراوە کە کێیە ئەو کەسەی لەناو کۆنگرێسدا متمانەی پێ دەکرێ.

کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی کۆنگرێس و هەموو باس و خواسەکانی لەبەردەم رۆژنامە و خەڵکیدا کراوەن. بەڵام تەنیا لەبەر هەندێ هۆی تایبەت بەئاسایشی نەتەوەیی دادەخرێن.

مەحزەری دانیشتنەکانی کۆمیسیۆنەکانی حکوومەت و ئاژانسەکان بەپێی مەرج و بەندە یاساییەکانی حکوومەتی ناوەند بەڕێوە دەچن کە لەژێر ئەو دروشمەدایە «حکوومەت لەبەر تیشکی رۆژی رووناکدا» بەم پێیە دەبێ کۆبوونەوەکانیان لەبەردەم راگەیاندن و چاپەمەنی و خەڵکیدا کراوە بن.

لە ناواخنی ئەو بڕیارەدا، جێ بۆ کۆبوونەوە داخراوەکان خۆش کراوە، ئەوەشیان لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی وەك: بەرگریکردن لە نەتەوە و نیشتمان، نهێنیە بازرگانییەکان، مەسەلە شەخصی و تایبەتییەکان، پاراستنی نهێنییەکان، کێشە دادوەرییەکان، هەموو ئەو کێشانەی کە تەحقیقیان لەسەرە و نابێ وامان لێ بکەن بەناوی دەستپێشخەریی قۆزتنەوەی هەواڵەوە خۆمان تووشی هەڵە بکەین.

## گەیشتن بە مەحزەری دانیشتنەکانی دادگا

ڕۆژنامە و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و خەڵکی بەپێی هەقێکی دەستووریانە بۆیان هەیە کە ئاگایان لە مەحزەری دانیشتنی قۆناغە سەرەتاییەکانی بەر لە دادوەریش بێ، هەرچەند دەوڵەت بەناوی بەرژەوەندی و پاراستنی نهێنییەوە دەتوانێ باز بەسەر ئەو هەقەدا بدات، کاتێك کە هیچ بەدیلێکی دیکە بۆ پاراستنی ئەو نهێنییە نەبێ، لەم حاڵەتەدا دادوەرییەکان بەدزییەوە ئەنجام دەدرێن، بۆ نموونە دادوەری ئەو منداڵەی کە شایەتی ئەوەی لەسەر خۆی دەدا کە پەلامار دراوە و تەعەدای جینسیی لێ کراوە بەدزییەوە ئەنجام دەدرێ، ئەوەش تەنیا لە پێناو پاراستنی ژیان و ئابرووی منداڵەکەیە، بگرە دادوەرییە سەرەتایی و تەمهیدییەکانیش دادەخرێن هەتا مەحزەرەکانی بەر لە دادوەرییەکەش قفڵ دەدرێن، چونکە ترسی ئەوە هەیە بەبڵاو بوونەوەیان، شکات لێکراو هەقی ئەوەی نەمێنێ بگاتە دوا ئاکامی دادوەرییەکی عادیلانە ئەویش لە ئەنجامی خۆ تێ هەڵقورتاندنی ئەم و ئەو. هەرچەندە ئەم جۆرە بواردنانەش دەگمەنن.

دادگای باڵای وڵاتە یەکگرتووەکان یاسای وای دانەڕشتووە کە ئەم هەقە مەسەلە و کێشە مەدەنییەکانیش بگرێتەوە، بەڵام چەندەها دادگای خوارتر ئەم هەقەیان پێ نەبەخشرا.

هەقی وەدەستهێنانی دۆکیومێنتەکانی نێو دادگا ئەوەندە ڕوون و ئاشکرا نییە. کەچی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دادگاکان بڕوایان بەوەیە کە ئەم جۆرە دۆکیومێنتانە، هەتا ئەوانەش کە پێش دادوەرییەکە کەشف کراون، بخرێنە بەردەست... تەنیا لەبەر چەند هۆیەکی زۆر پێویست کە زۆریان لێ دەکا ئاوا ڕەفتار بکەن لە هەندێ حاڵەتدا دۆکیومێنتەکان (بەڵگەنامەکان) تا کۆتاییی مەحزەری دادگاکان هەڵدەگیرێن. خۆ ئەگەر

لایەنەکان و کەسانی تێوەگلاو لە کێشەیەك لە دەرەوەی دادگا گەیشتنە چارەسەرێك، ئەوە دادگاکان داوا دەکەن لە پاڵ ئەو دۆکیومێنتانە کەینوبەینی ئەو گفتوگۆ و چارەسەرییەی دەرەوەی دادگاکانیش بەنهێنی هەڵگیرێن و بیپارێزن، ڕەنگە ئەوەیان مەتڵەبی لایەنە دژوارەکانیش بێ دادگای باڵاش جەخت لەسەر هەمان نهێنی پاراستن دەکات.

ڕۆژنامە و دەزگاکانی ڕاگەیاندن ئەو هەقەیان هەیە لەسەر هەموو مەحزەرەکان بێ کۆتوبەند ڕاپۆرتی خۆیان بنووسن. هەرچەندە حاکمەکان هەندێ جار فەرمانی وا دەردەکەن کە ڕێ لە میدیاکانی هەواڵ بگرێ لە بڵاوکردنەوەی ئەو بەشانەی مەحزەرەکان کە مەرجە بەنهێنی بمێننەوە، دادگای باڵاش فەرمانی ئەم جۆرە حەرامکردنەی دەرکردووە، بەمەرجێ لە زۆر حاڵەتەکاندا فەرمان و داواکاری نادەستووری بن.

لە ڕووی تیوریشەوە لە ژێر تەئسیری بار و زرووفی زۆر تایبەت و دەگمەندا ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکان بۆیان نییە ڕاپۆرت لەسەر مەحزەرەکان بڵاو بکەنەوە.

دادگای باڵا بە دەستنیشان کردنی ئەم سێ حاڵەتە هەق و ناهەقی بڵاو کردنەوەی هەموو حەقیقەت و گشت مەحزەرەکانی لە سەنگی مەحەك دا:

١- لەوانەیە بڵاوکردنەوەی هەقی گەیشتن بەدادوەرییەکی ڕاست و دادپەروەرانە بشێوێنێ.

٢- بۆ پاراستنی ئەو هەقە هیچ بەدیلێك نییە.

٣- فەرمانی قەدەغە کردنی مەحزەری دانیشتنەکان ئەو هەق و بەرژەوەندییە دەپارێزێ.

سەفەر و ڤیزا:-

ڕۆژنامەنووسان سەربەستن بۆ هەر شوێنێك کە لەبەردەم خەڵکی کراوەن، لەناو وڵاتدا، سەفەر بکەن. هەروەها بۆیان هەیە بەمەبەستی

کۆکردنەوەی هەواڵ، سەفەری دەرەوە بکەن، هەتا بۆ وڵاتێکی وەك کوباش، کە ئەمریکا ئابلۆقەی خستووەتە سەر و سوپاکانیان بەرامبەر یەکتر وەستاون بەگشتی کۆسپ و تەگەرەیان لەبەردەمدا نییە.

## ڕاپۆرتی نۆیەم: ڤینزوێلا

دانیشتوان: ١٩.٧٥٠.٠٠٠

ڕێژەی خوێندەواری: ٨٨٪

ڕادیۆ: یەکێك بۆ (١١) کەس

تەلەفزیۆن: یەکێك بۆ (٦/٦) کەسێك

ڕۆژنامەکان: (٧٩)

بڵاوکراوە وەرزییەکان (٦٠)

ساڵی ئیقرار کردنی: پەیمانی سیاسی و مەدەنی لەگەڵ (UN) ١٩٤٥

* هیچ یاسایەکی تایبەت بە «سەربەستیی زانین» لە ئارادا نییە. بەڵام بەهەر حاڵ ڤینزوێلا لە گەلێ پەیمان و ڕێککەوتننامەی جیهانیدا بەشدارە کە ئەگەر لە بەندەکانی دەستوور لای ئەداو کۆنگریسی کۆماری ئیقراری لەسەر ئەو پەیمانانە کرد ئەوە دەبێ بەیاسا. لەو پەیمانە جیهانییانەش بەندی ژمارە (١٩)ی جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤە لەسەر ئاستی جیهان، بەندی ژمارە (١٩)

خاڵی یەکەم: ڕێککەوتننامەی جیهانی بۆ مافە ڕامیاری و مەدەنییەکان، بەندی ژمارە (٤)ی جاڕدانی ئەمریکی بۆ مافی مرۆڤ کە دەڵێ: «هەموو کەسێك سەربەستە لە بەدواداچوون و پشکنینی حەقیقەتەکان، ڕادەربڕین، بڵاوکردنەوەی هەر بیر و باوەڕێك لە ڕێگەی هەر کەناڵێکەوە بێ» لە دەستوورەوە و لەو یاسایانەی کە لە ڤینزوێلا کاریان پێ دەکرێ ڕێگەی بۆ ڕۆژنامەنووسەکان یان هەر هاووڵاتییەك خۆش کردووە دەستی بگاتە بەڵگەنامە و زانیارییەکان هەر وەختێ کە پێویست بێ. بەندی ژمارە (٦٧) لەو دەستوورە ڕوونی کردووەتەوە کە:

«هەموو کەسێك هەقی ئەوەی هەیە داوایەك پێشکەش بەهەر

فەرمانبەرێکی مەدەنی یا هەر ئاژانسێك بکات سەبارەت بەهەر مەسەلە و کێشەیەك کە لە توانای ئەو فەرمانبەرەدایە و دەبێ لەکات و ساتی دیاریکراویشدا وەڵامی ئەو داوا و پرسیارەی دەستگیر بێ».

«یاسای کارنامەی رۆژنامەگەری» ڕاستەوخۆ دان بەوەدا نانێ کە رۆژنامەنووسان بتوانن بەئاسانی دەستیان بگاتە سەرچاوەکانی زانیاری. یان هەقێکی تایبەتییان هەبێ کە داوای بەڵگەنامە و زانیاری لەهەر کەس و لایەنێك بکەن، بەڵام ئەو هەقە لە ناواخنی تەشریعاتی ئەو یاسایەدا بەرجەستە بووە یان ئاماژە بەوە دەکا کە رۆژنامەنووس بۆی هەیە بگەڕێ، بگرە هەواڵ و باس و خواسەکان بڵاو بکاتەوە.

هەر بەهەمان شێوە ڕۆژنامەنووس هەقی ئەوەی هەیە سەربەستانە بەدوای زانیاریی ڕاستەقینەدا بگەڕێ، وەك لە بەندی (٨)ی «یاسای کارنامەی رۆژنامەگەریدا» هاتووە کە ئامارەش بەوەش دەکا بەتەواوی هەقیان هەیە کە ناوونیشانی سەرچاوەی زانیارییەکان بەنهێنی و تەقەت بپارێزن.

«ڕۆژنامەنووسان مافی ئەوەیان هەیە نهێنی پیشەییان بپارێزن و لە بەردەم گرووپ و تەرەفی سێیەمدا هیچ ئاشکرا نەکەن، قەتیش بەزۆری ناوی سەرچاوەکانی زانیاری و نهێنییەکان نادرکێنن و نابێ کەس ئەو داوایەیان لێ بکات تەنیا لە حاڵەتێکی تایبەتدا نەبێ ئەویش مەسەلەی تاوان و کوشتن و بڕینە».

تەنیا لە گەیشتن بەهەندێ زانیاریی تایبەتدا کۆتوبەند هەیە بەپێی بەندی ژمارە (٦٣)

لە دەستووری نیشتمانیدا هاتووە: «دەفتەرەکانی حیساب، هەرچی قەواڵە و سەنەدە، بەڵگەنامەکان، حسابی کڕین و فرۆشتن، تەنیا، دەخرێنە بەردەستی لایەنە پسپۆر و دەسەڵاتدارەکان بەگوێرەی یاسا».

سەبارەت بەبەڵگەنامەکانی هەر کێشەیەکی دادگایی هەندێ کۆتوبەند هەن کە گەیشتن بەو بەڵگەنامانە زەحمەتتر دەکەن، بەتایبەتی کە هێشتا کێشەکە نەبڕاوەتەوە و حاکم لە کەینوبەینی ئەوەدایە حوکمی خۆی دەربکات.

دەستووری تاوانکاری ڤینزوێلا کۆتوبەندی زۆر ئاشکرای داناوە، نەك سەبارەت بەکۆکردنەوەی زانیاری، بەڵکو سەبارەت بەئاشکراکردنی زانیارییەکانیش، هەمان کۆتوبەندە کە دەگا بەوەی سنوور دابنێ و گەیشتن بەڕاستیی ڕووداوەکان زەحمەت بێ. بەندی (١٩٠) لە «دەستووری مەدەنی»دا ڕوونی کردووەتەوە کە «هەر کەسێك بەپێی شوێن و مەقامی خۆی، کار و پیشە یان هونەرەکەی نهێنییەکی لایە. بەڵام بەدرکاندنی ئەو نهێنییە کۆمەڵێ کارەسات بنێتەوەو ئەگەر ئەو کەسە بەبێ هۆیەکی دروست و مەعقوول ئەو نهێنییەی درکاند، دەکرێ لە پێنج تا سیی ڕۆژ زیندانی بکرێ».

دەستووری مەدەنی چەندەها بەندی تێدایە کە کۆسپ دەخاتە بەردەم ڕۆژنامەنووسان و نەتوانن تەحقیقاتی قووڵ و تێرتر بکەن، چونکە هەندێ جار گەر هات و ئەو لێکۆڵینەوە و تەحقیقات و بەدواداچوونە بڵاو بکەنەوە، لەوەدایە بەناوزڕاندن و ئابڕووبردن و ئیفترا تاوانبار بکرێن، یان پۆزش بۆ ئەو کەس و لایەنانە بێننەوە کە تاوانیان دەرهەق کردوون. یان بڵاوکردنەوەی ئەو تەحقیقانە ببێتە هۆی شێواندنی ئاسایشی تاك و کۆمەڵ لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا ڕۆژنامەنووسان بەرپرسیار دەبن.

هەنووکە هەوڵێکی وا لە ئارا دایە کە یاسایەکی نوێ ئیقرار بکرێ، بۆ پاراستنی شەرەف و ئابڕووی تاکەکانی کۆمەڵ. بەبڕوای ڕۆژنامەنووسانی ڤینزوێلا ئەمەیان دامەزراندنی سانسۆرێکە بۆ ئەوەی ڕێ لە ڕۆژنامەنووسان بگرێ دەستیان نەگاتە سەرچاوەکانی زانیاری.

خۆشبەختانە تا ئێستا پەرلەمان ئیقراری لەسەر ئەو یاسایە نەکردووە.

سەبارەت بەنهێنییەکانی دەوڵەتی هیچ یاسایەکی دیاریکراو نییە، بەڵام ئەو یاسایانەی کە کاریان پێ دەکرێ، هەندێ کەرەستە و بابەت و دۆکیومێنت بەشتی نهێنی لە قەڵەم دەدەن. دەستووری دادی سەربازیی، ڤینزوێلا کە لە ڕووی تیۆرییەوە بەتەنها بۆ ئەفسەرانە: هەموو کەرەستە و بەڵگەنامە و نامە ڕەسمییەکان و هەواڵە نهێنییەکانی هێزەکانی سەربازی و یان هی دەزگاکانی ئاسایش لە بازنەیەکی داخراودا دەمێننەوە.

هەروەها یاسای ئۆرگانی ئاسایش و بەرگری لە دەوڵەت ئاماژەی بۆ ئەو هەموو کەرەستە و بابەتانە کردووە کە بە نهێنیی دەوڵەت حسێب دەکرێن، بەناوی ئەوەی کە ئاسایش و بەرگری لە نەتەوە و نیشتمان لەو یاسا و دەستوورەدا بەرجەستە بن. لە ڕاستیدا دەسەڵاتی جێبەجێکردن، نهێنییەکان دەستنیشان دەکات، بەڵام بۆ ئەم مەسەلەیە هیچ متمانە و بڕوایەکی شەرعی لە ئارادا نییە.

ڕۆژنامەنووسان لەم جۆرە مەیدانە ترسناکانە، دوور دەکەونەوە، چونکە دەزانن پەردە هەڵدانەوە لەسەر بەڵگەنامە نهێنییەکان، سزای قورسی بەدواوەیە.

بۆ نموونە: بەپێی «یاسای دادی سەربازی» دوو ڕۆژنامەنووس دادگایی کران بەتۆمەتی ئەوەی هەندێ نهێنیی سەربازییان بڵاو کردبووەوە و بەڵام ملیان نەدابوو ناوی ئەو سەرچاوانە بدرکێنن کە زانیارییەکەیان لێ وەرگرتبوو، بەتۆمەتی «هەڵگەڕانەوەی سەربازی»، دادگایی کران کە دەکرێ تۆمەتی وا بۆ زۆر نیاز و مەبەست بەکاربێت، بەڵام ڕۆژنامەنووسەکان ئەو دادوەرییەیان بردەوە، هەرچەندە بەدرێژایی وەخت ملکەچی قۆناغەکانی دادوەرییەکە بوون کە ئەوەشیان بۆ ئەوان کۆسپ و تەگەرەی گەورەن.

لە ڕاستیدا زۆربەی ڕۆژنامەنووسان خۆیان بەرپرسمی ئەو دەزگا و میدیایەوە دەبەستنەوە کە کاریان بۆ دەکەن، ڕاپۆرت و تەحقیقاتی سەربەستانە کەمن. هەر ڕۆژنامەنووسێك تەحقیقێکی لابەلایی بکاتەوە، کە سەر ئێشە بنێتەوە دادگا دەتوانێ داوای لێ بکا وازبێنێ.

ڕۆژنامەنووسانی ڤینزوێلا زۆر بێزارن لەوەی کە دەسەڵاتدارەکان پەنا دەبەنە بەر کوشتن و برینی کارەکتەرەکان، زۆر جاریش بەوە تاوانبار دەکرێن و ڕای جەماوەریش بەو ئاراستەیە دەبرێ کە ڕۆژنامەنووسان، ئاژاوەگێڕن.

بەشێوەیەکی نارەسمیش زەختی زۆر دەکرێتە سەر ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان ئەگەر خۆیان دا لە قەرەی ڕاپۆرت و تەحقیقی ترسناك.

## گەیشتن بە بەڵگەنامەی میری

ڕۆژنامەنووسانی ڤێنزوێلا، هەمان ئەو مافانەیان هەیە کە لە دەستوور و یاساکانی دەوڵەتدا بەهاووڵاتییان بەخشراوە، هیچ یاسا و ئیمتیازێکی تایبەتییان نییە.

بەمانا شەرعییەکەی بەڵگەنامە حکومییەکان ئەوانەن کە دەچنە نێو نۆفیسەکان و تۆمار دەکرێن، بۆ گەیشتن بەو بەڵگەنامانە هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك نییە. گەیشتن بە بەڵگەنامە حکومییەکان کە لەژێر دەستی فەرمانبەرەکانی دەوڵەتن (بۆ نموونە: لە وەزارەتی دارایی، وەزارەتی بەرگری)، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێوانەی کە خۆیان بەباشی دەزانن، هیچ بەند و مەرجێکی یاسایی لە ئارادا نییە کە شێوەی گەیشتن بە بەڵگەنامەکان ڕێك بخات، بەمانا عەمەلییەکەی فەرمانبەرانی حکوومی گەر بیانەوێ دزی و فزی، فڕ و فێڵێك بشارنەوە ئەوە کۆسپ و تەگەرە دەخەنە بەردەم گەیشتن بە دۆکیومێنتەکانی ژێر دەستیان یان کاری نایاساییان کردبێ، یان هەر مەسەلەیەك کە پەیوەندیی بەکەرتی

کۆمەڵایەتییەوە هەبێ. لە ئەنجامی ئەوەدا ڕۆژنامەنووسان پشت دەبەستن بە بۆچوون و ئارەزووی فەرمانبەران لە بواری کۆکردنەوەی زانیاریداو **هیچ** پێوانەیەکی دیاریکراو لە ئارادا نییە.

## گەیشتن بە تۆمار و ئیش و کارەکانی دەسەڵاتە حکوومییەکان

هیچ یاسا و فەرمانێك بۆ ئەم مەبەستە دانەڕێژراوە، **بەڵام** واقیعی حاڵ وای کردووە بۆ ئەو مەبەستە ڕێوشوێنێك بدۆزرێتەوە ڕۆژنامەنووسان دەتوانن بۆ زانیاری **کۆکردنەوە** پەیوەندی بەو لایەنانە بکەن، یان ئەوەتا بەدوای سەرچاوەی **تایبەتیدا** بگەڕێن، **بەڵام** بۆ ئەم **حاڵەتەش** ڕێڕەوێکی کارگێڕ لە ئارادا نییە.

## گەیشتن بە مەحزەری دانیشتنەکانی پەرلەمان

سیستمی- ڤینزوێلا هیچ کۆتوبەند**ێکی** یاسایی دانەڕشتووە، بەڵام لە ڕاستیدا هەندێ ئەندام پەرلەمان **هەوڵیانداوە** دەرگای پەرلەمان داخەن بەمەبەستی ڕێگەگرتن لە ڕۆژنامەنووسان، وەختێ بزانن بەڕۆحی ڕەخنەگرانەوە لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە**کانیان** ڕاپۆرت دەنووسن.

بەهەر حاڵ سەندیکای ڕۆژنامەنووسان و ڕای گشتی جەماوەر خۆیان زاڵ کردووە، توانیویانە هەقی **گەیشتن** بەزانیاری لەناو پەرلەماندا مەیسەر بکەن. سەبارەت بە دەعوا و شکایەتی جەماوەر «دەستووری ڤینزوێلا-ی ڕێوشوێنەکانی تاوانکاری»، هەندێ کۆتوبەندی داناوە، بۆ نموونە کاتێ تەحقیقات لە تاوانێك دەکرێ یان حاکم لە ڕێی ئەوەدایە حوکمی خۆی دەربکا.. لەهەردوو حاڵەتدا مەرجی تایبەت دانراون.

بەهەر حاڵ، لە ڕووی عەمەلییەوە، ڕۆژنامەنووسان و فەرمانبەران ئەو کۆتوبەندە ڕەت دەکەنەوە، لە ڕاستیدا هەتا لەمیانەی دادوەری و تەحقیقاتیشدا ڕۆژنامەنووسان ڕاپۆرتی خۆیان ئامادە دەکەن.

هیچ ڕۆژنامەنووسێك دادگایی نەکراوە لەسەر ئاشکرا کردنی زانیاری سەبارەت بەو کێشە و دەعوایانەی کە هێشتا لە گەرمەی تەحقیقاتدان.

## گەیشتن بە مەحزەرەکانی دادگا

دیسانەوە هیچ کۆتوبەندێکی یاسایی نییە، بەڵام حاکم بۆی هەیە بەفەرمانێکی تایبەت سنوورێك ڕەسم بکا و زانیارییەکان لە ئۆفیسی خۆی بپارێزێ و نەهێڵێ لە ڕۆژنامەکان و کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە بڵاو ببنەوە. بۆ پاراستنی سەلامەتیی خەڵك و ئاسایش، یاسا ئەو هەقەی بەحاکم بەخشیوە.

سەفەر و ڤیزا: هیچ کۆتوبەندێکی لەسەر نییە.

## ڕاپۆرتی دەیەم: زیمبابۆی

دانیشتووان: ١٠.٢٠٥.٠٠٠

ڕێژەی خوێندەواری: ٦٧٪

ڕادیۆ: یەکێك بۆ (٢٣) کەس

تەلەفزیۆن: دانەیەك بۆ (٧١) کەس

ڕۆژنامەکان: (٣)

بڵاوکراوە وەرزییەکان (٥)

هیچ پەیمانێکی ڕامیاریی و مەدەنی لەگەڵ (UN) مۆر نەکراوە.

هیچ بڕیارێك بۆ «سەربەستیی زانین» لە زیمبابۆی دەرنەچووە، لەوەش ناچێ بەتەمای بڕیاری وابێ چونکە نە بۆ ئێستا و نە بۆ داهاتوو مەیلێکی وا لە ئارادا نییە، سەربەستتی گەیشتن بەزانیارییش لەوێ باو نەبووە.

یاسای نهێنییە ڕەسمییەکان میراتی سەردەمی پێش سەربەخۆیی وەرگرتبوو، بەڵام دوای سەربەخۆیی ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات و گۆڕا و یاساکەش فراوان و گشتیگیرە. پتر کاریگەری لەسەر فەرمانبەرە مەدەنی و یان هەر زانیارییەکی ڕەسمی و پاراستنی بەڵگەنامەکانەوە هەیە.

ئەو بڕیارە هەموو مەیدانە تایبەتی و سنوورە داخراوەکانیش دەگرێتەوە بۆ نموونە: سەربازی یان ئەو مەیدانانەی کە زۆر بە حەساسیەتن، هەمیشە دەبێ بۆ زانیارییەکان، هەر چۆنێك بێ، جێی متمانە بن و زایە نەکەن، کە دیارە ئەو زانیارییانەش دەگرێتەوە کە لە کەسێکەوە وەردەگیرێن یان دەردەچن، سەرەڕای ئەو زانیارییانەی کە لەلایەن هەر کەسێکەوە زانراون لەگەڵ ڕێ خۆشکردن بۆ گەیشتن پێیان ئەویش لە ڕێگەی کار و پیشەوە و پەیوەندیدارییان لەگەڵ سەرچاوەکانی ئەو زانیارییانە.

هەڵەیەکی وا کە زانیاری تیا پەرت بێ، جا چ لە ناوەوەی وڵات بێ و چ

لە دەرەوە، چ لەلایەن هاووڵاتییەکەوە بێ چ نیشتەجێ کرابێ، بەتاوان حیساب دەکرێ. وەك وتمان لە مەیدانی سەربازی و یان هەر مەسەلەیەك کە پەیوەندی بە«بەرژەوەندی نەتەوەیی»یەوە هەبێ دەکرێ کۆتوبەندی بخرێتە سەر کە ڕەنگە ئەو کۆتوبەندە هی ئەو سەردەمە بێ کە لە یەك لاوە سەربەخۆیی ڕاگەیەندرا، ئەو کۆتوبەندە هەموو زانیارییە ئابوورییەکانیش دەگرێتەوە.

کارتێکردنی تەواوی ئەو یاسایە هەموو تەشریعاتە پەیوەندیدارەکانی تر وای کردووە کە زەمینەیەکی وا دروست دەبێ کە جۆرە ترسێك لە ڕەتکردنی ئەو زانیارییانەدا هەبێ کە بەحیساب زانیاریی بە بایەخ و ناسکن، ئەم پەردەپۆش کردنی زانیارییە بۆ سەردەمی بەر لە سەربەخۆ بوون دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەم هەڵوێستە لە دوای سەربەخۆییش هەر بەردەوام بوو، دوایی بەناوی تازەکردنەوەی دەستکاریی یاساکان کرا. بەڵام زۆربەی یاساکان کە پابەندی قۆناغی سەربەخۆیی بوون تا ساڵی ١٩٩٠ وەکو خۆیان مابوونەوە، بەناوی پاراستنی ئاسایشەوە کاریان پێ دەکرا. بەپێی بڕیارە نهێنییە ڕەسمییەکان سزای تایبەت بۆ ئەو کەسانە هەیە کە زانیاری دەبەخشن و وەردەگرن، سزاکەش ئەوەندە توندە تا دەگاتە بیست ساڵ زیندانی یان غەرامەی دووسەد هەزار دۆلار. لەوەتەی زیمبابۆی سەربەخۆیی وەرگرتووە، زۆر بەکەمی کار بەم بەندانە کراوە، بەڵام ئەگەر کرابێ، تەشریعاتی لەو بابەتە ملی ڕۆژنامەنووسەکانی گرتووەتەوە، بۆ نموونە: لەوەتەی زیمبابۆی سەربەخۆیە تەنیا پێنج پەیامنێری بیانیی لە وڵات دەرکردووە، ئەویش لەسەردەمی کێشەکانی «ماتابێلیلاند» کە دەکەوێتە نێوان ساڵانی ١٩٨٢-١٩٨٤، گەرچی لە ساڵی ١٩٨٦ یەکێ لە هەواڵنێرەکانی «ئاسۆشیەتید پرێس»، دەرکرا؛ چونکە هەندێ نهێنیی سەبارەت بەسیاسەتی حکوومەت دەرهەق بەمۆزەنبیق ئاشکرا کردبوو.

## گەیشتن بە دۆکیومێنتە حکومییەکان

لە ڕووی یاساییەوە ڕۆژنامەنووسان بۆ گەیشتن بەبەڵگەنامە ڕەسمی و حکوومییەکان هەمان هەقی هاوڵاتییەکیان هەیە، ئەگەر مەبەست لە «بەڵگەنامەی حکوومی»، هەموو ئەو کەرەستانەی وەك: ڕاپۆرتەکانی دادگا، غەزەتەی حکوومەت یان ڕاپۆرتە ڕەسمییەکان بێ.. هتد. ئەم جۆرە گەیشتن و وەدەستهێنانە تەنیا بۆ دوا بەڵگەنامە چاپکراو و بڵاو کراوەیە. بەڵام بۆ گەیشتن بەباکگراوندی بابەت و کەرەستەکان یان تێبینی و سەرنجەکان لەسەر دەمەتەقێ و گفتوگۆکان بەر لەوەی بووبن بەڕاپۆرت قەدەغەیە و لە دوا پاکنووسی ڕاپۆرتەکاندا، نابێ ئەو شتە پێشینانە تۆمار بکرێن. بەم شێوەیە هیچ خۆ ئامادەکردنێك بۆ دوا دەقی بڵاوکراوە نییە، زۆربەی جار لە ڕووی عەمەلییەوە دوو فاکتەر هەن کە سنوورێك بۆ گەیشتن بە بەڵگەنامەکان دادەنێن.

### ١ – نەبوونی بابەتە چاپکراوەکان

تۆمارەکانی دادگا بەجیا، بەڵگەنامە ڕەسمییەکان زۆربەی جار چاپ ناکرێن، بەتایبەتی کە تازە ئامادە دەکرێن، هەندێ جار هی ئەوەیە بەژمارەیەکی کەم چاپ دەکرێن. لە نموونە تازەکان:

دوا ڕاپۆرتی «ساندورا»، بوو سەبارەت بەپیشەسازیی مۆتۆر، کە فرۆفێڵ و فەسادی تێ کەوتبوو کە وای کرد کە چەندین کابینە دەست لە کار بکێشنەوە، یان ئەو ڕاپۆرتە ڕەسمییەی سەبارەت بەفەسادی نێو کارگەی ئاسن و پۆڵا ئامادە کرابوو کە ناوی «فریسکۆ» بوو: ڕۆژنامەنووسان لە ڕێگەی پەیوەندیی ناوەکیی خۆیانەوە گەیشتن بەو ڕاپۆرتانە. ئەم کەموکوڕی و نوشوستییە مەرج نییە لە شەڕ و پیسییەوە هاتبێ، مەسەلەکە پتر خەراپیی کار بەڕێوەبردنە نەك شەڕ و نەگریسی.

## ٢- پەردەپۆشکردن و شاردنەوی بەڵگەنامەکان بەرەسمی

یان هاریکاری نەکردن لەگەڵ رۆژنامە و دەزگاکانی راگەیاندن: ئەوەش بەئاشکرا لەوەدا بەرجەستە بووە کە دژایەتیی رۆژنامەنووسان دەکرێ و بەتەواوی دیارە کە فەرمانبەران تا بۆیان بکرێ زانیاری بەرۆژنامەکان نابەخشن. لەپاڵ ئەو هۆیانەی سەرەوە فەرمانبەرە بچووکەکان ترسێکی گەورەیان هەیە و وا ناکەن دونیا لە خۆیان بورووژێنن. بۆ نموونەك لە هەندێ لەو ناوچانەی دەرەوەی «هاراری» فەرمانبەرە ناوخۆییەکان پتر چنگ لە زانیارییە رەسمییەکان گیر دەکەن و نایبەخشن بەکەس، لەوەدا بۆڕی فەرمانبەرانی شاریان داوە، بەهەمان شێوە لەناو وەزارەتەکانیش فەرمانبەران بۆیان نییە هیچ تەعلیقێکیان لەسەر هیچ مەسەلەیەك هەبێ گەر پرس بە لەخۆیان گەورەتر نەکەن کە زۆربەی جار وەزیرەکانن کە گەیشتن بۆ زانیاری بۆ ئەوانیش هەر زەحمەتە.

### گەیشتن بە مەحزەری دانیشتنەکانی لایەنە دەسەڵاتدارەکان:

رۆژنامەنووسان لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکدا هەمان مافیان هەیە کە لە وەرگرتنی زانیاری لە کۆبوونەوەکانی لایەنە دەسەڵاتدارە ناوخۆیی و ناوچەییەکاندا هەیە بۆ نموونە: کە مەسەلە پەیوەندیی بەئاسایشی ناوخۆ و دەرەوە هەبێت ئەوە دەکرێت کۆبوونەوەکان دابخرێن.

لە بەندێکی یاساییدا هاتووە: «ئەگەر ئەنجومەن بزانێ وا بەقازانجتر و گونجاوترە کە مەسەلەیەك یان کێشەیەك بەدزییەوە گفتوگۆی لەسەر بکرێ» لەم حاڵەتەدا کۆبوونەوەکە لەبەردەم رۆژنامەنووسان و جەماوەر دادەخرێ، هەموو باسوخواسەکانی ئەو دانیشتنانەش هەر بەداخراوەیی دەمێننەوە. هەندێ جار کردنەوە و داخستنی کۆبوونەوەکان لەسەر هەوا و هەوەسی فەرمانبەران وەستاوە. بۆ نموونە: ئەنجومەنی شاری «هاراری» دەرگای خۆی بەرووی هەواڵنێرێکی ناوخۆ داخست لەسەر ئاساسی

ڕاپۆرتێك كه ئەمیندارى دۆسیەكانى شار بەكارێكى دوژمنكاریى دانا.

وەك پرنسیپ گەیشتن بەهەموو فیگەرە ڕامیارى و مەدەنییەكان، بەتەواوى كراوەن، لەگەڵ ئەوەشدا.وەزارەتى ڕاگەیاندن توانیویەتى كۆنترۆڵى چۆنیەتیى گەیشتن بە وتە و قسەى وەزیرەكان یان نوێنەرانى وەزارەت بكات، بەڵام لە قاڵبێكى ڕەسمیدا هەموو ئەو پرسیارانەى كە لە وەزیرەكان دەكرێن دەبێ بەكەناڵى وەزارەتى ڕەگەیاندندا بڕۆن. ئەمەش وادەكات وەڵامەكان دوا بكەون و وەختى دیاریكراویان نییە.

جا لەبەر ئەوە ڕۆژنامەنووسان هەوڵ دەدەن كە سیستمى پەیوەندیى شەخسى خۆیان پەرە پێ بدەن، بەتایبەتى لەگەڵ وەزیرەكان و سكرتێرە هەمیشەییەكان، كە دەكرێ بگەنە لاى هەندێكیان، بۆ هەندێكى تر مەحاڵە بیانگەنێ. بۆ گەیشتنە لاى نۆفیسى سەرۆكى وڵات تەنیا وەزیرى ڕاگەیاندن بۆى هەیە ئەم بوارە برەخسێنێ، بەڵام گەیشتنە لاى هەندێ لە وەزیرەكان ئاسانترە، ئەوەش بەتەواوى دەوەستێتە سەر كۆششى ڕۆژنامەنووسەكان بۆ خۆیان. لە ڕاستیدا «بەشى ڕۆژنامەگەرى و زانیارى» لە وەزارەتى ڕاگەیاندن دوو ڕۆڵ دەبینێ یان ئەوەتا دەبێ بە پردى سەربەستى بۆ پەڕینەوەى زانیارى یان دەبێ بە بەربەستێكى گەورە.

## گەیشتن بە مەحزەرەكانى پەرلەمان

دەستوور هیچ ئامارەیەكى نەكردووە سەبارت بەوەى ڕۆژنامەنووسان بەئاسانى بگەنە نێو پەرلەمان، یان سەبارەت بەداواكانى جەماوەر. بەڵام تەقلیدێك بۆ ئەم بەربەستییە و كرانەوەیە هەیە، لەسەریشى ڕۆیشتوون، بەڵام ڕەنگە ڕێ لە هەر میوانێك بگیرێ گەر شڕ و شەپرێو بێ. پەرلەمان كراوەیە و بۆ ڕۆژى دواتر ڕاپۆرتەكان بەچاپكراوى دەردەچن.

بەندێكیش هەیە كە دەڵێ: «پەرلەمان دەتوانێ كار و نیشەكانى خۆى ڕاپەڕێنێ» كە ڕێگە دەدا بەدزییەوە خولەكانى دانیشتن ئەنجام بدرێن. كە

دیاره ئەوەشیان زۆر بەکەمییە. مۆرکی ئەو مەحزەرە ئاشکرا یان وەك مەتڵەبی جەماوەر زۆر درامییانە لە کێشەی (ساندورا- ویلۆوگەیت) بەرجەستە بوو کە لە مەغزا رامیارییەکەیدا بوو بەنموونەی دیموکراسی کە هەموو کەس بۆ خۆی هەستی پێ کرد.

## گەیشتن بەمەحزەرەکانی دادگا

دەستوور بەتایبەتی ئەوەی روون کردووەتەوە کە مەحزەری هەموو دادگاکان دەبێ لەبەردەم جەماوەردا کراوە بن، ئەوەش بەگشتی کاری پێ دەکرێ. بەڵام تەشریعاتی واش هەیە کە هەڵاویردنی تێ دەکەوێ.

بۆیە لە پێناو بەرژەوەندی خەڵکیدا دەکرێ لەسەر هەندێ کێشە، ئامادە بوون و راپۆرت نووسین، حەرام بکرێ، یان هەر مەسەلەیەك کە هێشتا لە کەینوبەیندا بێ.

دەکرێ کۆتوبەند بخرێتە سەر هەندێ مەسەلەی تایبەت بە بەرگری، ئابووری، سەلامەتی گشتی و ئاسایشی ناوخۆ کە داوا دەکات راپۆرتیان دەربارە بنووسرێ، بەهەمان شێوە هەر راپۆرتێك بۆ بەرکەماڵیی دادوەری زەرەری هەبێ، یان بۆ ئەخلاقی عەوام یان بۆ ئەو مێرد منداڵە زەرەری هەبێ کە تەمەنی لە ١٨ ساڵ کەمترە، یان گەر بۆ سەلامەتیی ژیانی تایبەتی شایەتەکان پێویست بێ. لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا دەبێ نووسینی ئەو جۆرە راپۆرتانە راگیرێ کە زەرەریان لە قازانج پترە، هەر کەسێك ئەم یاسایە بشکێنێ سزای پێنج ساڵ زیندانییە یا ئەوەتا دەبێ (٥٠٠٠) دۆلار بدات.

جاری واش هەیە هەردووکیانە.

سەفەر و ڤیزا: هیچ کۆتوبەندێك نییە. لە دەرەوەی مەیدانی داخراوی سەربازی.

# بەشی سێیەم

# ئاکامەکان

١- زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە سەرژمێر کران، لەسەر ئاستی هەموو دونیا، بەرەسمی خۆیان بەو مەبدەئانەوە دەبەستەوە کە لە بەندی ژمارە (١٩)ی جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤدا هاتوون.

٢- بەهەر حاڵ کۆتوبەندەکانیش ڕاستەوخۆ شوێن پێی ئەو مەبدەئە باڵایانە دەکەون کە ڕاگەیاندراون.

٣- لە زۆربەی وڵاتەکان، نهێنی پاراستنی تۆمارە حکوومییەکان، یان بەلایەنی کەم متمانە کردن بەو پاراستنە و ڕێوشوێنەکانی بوونەتە یاسا و دەستوور، بەڵام ئەو هەقەی کە دراوە بە لایەنە دەسەڵاتدارەکانی حکوومەت بۆ شاردنەوەی بەڵگەنامەکان و دوورخستنەوەیان لە چاو و پشکنینی خەڵك و جەماوەر زێدەڕۆیی تیا دەکرێ و هەندێ جاریش دەکرێ بە بڕوبیانوو تا کۆسپ بخەنە بەردەم ئیشەکانی ڕۆژنامەنووسان، مەسەلەش بەس ڕێگەگرتن نییە لەکاری ڕۆژنامەنووسان، بەڵکو ئەو دیموکراسییەی هاووڵاتی گەرەکیەتی گەشە ناکا و دەوەستێ.

٤- زۆربەی فەرمانبەرانی حکوومەت و کارمەندە مەدەنییەکان ئەرکی سەرشانی خۆیان بیر دەچێتەوە لە بەرامبەر جەماوەردا، زانیارییەکانی نێو دەزگای میری وا دەشارنەوە وەك بڵێی موڵکی خۆیان بن.

٥- هەندێ لە وڵاتان هەوڵیان دا پتر ڕێ بۆ جەماوەر خۆش بکەن تا

دەستی بگاتە هەموو حەقیقەت و زانیارییەك، بەرپرسیارییەتی حکوومەتیش لەم ڕووەوە زیاتر بێ، ئەمانە ئەو وڵاتانە بوون کە یاسای سەربەستیی زانینیان پەیڕەو دەکرد، نموونەی ئەوەش «بڕیاری سەربەستی زانین»ە کە لە ئەمریکا دەرچوو.

٦- پێچەوانەی خاڵی پێنجەم نهێنی پاراستنەوەك مەرجێ بۆ حکوومەتێکی چاك. ئەوەشیان بەجوانی لە یاسای نهێنییە ڕەسمییەکانی بەریتانیادا بەرجەستە بووە. ئەو ئەقڵیەتی نهێنی پاراستنەش دژ بەفەلسەفەی پەرتبوون و بڵاو بوونەوەی زانیارییە کە لەلایەن ڕێکخراوە جیهانییەکانی وەك: "یونسکۆ" و (CSCE)، پشتگیری لێ دەکرێ و هان دەدرێ. ئەم بڕیاری «نهێنی شاردنەوە»یە دژ بە بەندەکانی «دواهەمین یاسای هێلسنگی»یە کە داوا لە هەموو وڵاتە بەشدارەکان دەکا «کە مەسەلەی بڵاو بوونەوە و دابەشبوونی زانیاری بە هەموو جۆرەکانییەوە فراوانتر و ئازادتر بکرێ» هەروەها دژ بەبەندی ژمارە (١٠)ی پەیمانی ئەورووپییە بۆ مافەکانی مرۆڤ ئەو پەیمانەی کە «نەك هەر زامنی ئەوە دەکا کە ڕۆژنامەکان سەربەستانە جەماوەر لە هەموو حەقیقەتێك ئاگادار بکەنەوە، بەڵکو دەبێ ڕاست و دروست زانیارییەکان بەهەموو خەڵکی بگەن».

٧- لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەدا ئەو وڵاتانەش هەن کە هیچ یاسایەکی دیاریکراویان بۆ سەربەستیی زانین نییە، بۆ دەست نیشانکردنی نهێنییە ڕەسمییەکانیش ئەوەندە دڵڕەق نین.

٨- بەهەر حاڵ، بوونی یاسای سەربەستیی زانین بەتەنیا بەس نییە بۆ ئەوەی «هەقی زانین» بداتەوە بە هاوڵاتییان. دوو مەرجی تر هەن کە زۆر پێویستن بۆ ئەوەی بەڕاستی کەڵك لە «یاسا و بزووتنەوەی سەربەستیی زانین» وەربگیرێ.

٩- یەکەم: لیستی سیاسیی حکومەتەکە بیەوێ بەپاکی پەیڕەوی ئەو یاسایە بکات. لەم ساڵانەی دواییدا، لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا، حکوومەت هەوڵی داوە مەودای کارکردنی ئەو یاسا و تەشریعاتە بەرتەسك بکاتەوە. هەروەها لە هەندێ لە وڵاتەکانی ئەمریکا کە یاسای سەربەستیی زانین-ی خۆیان پەیڕەو دەکەن لەوانی تر زیاتر کۆسپیان دەخستە سەر ڕێی گەیشتن بە زانیارییە ڕەسمی و حکوومییەکان.

١٠- مەرجی دووەم زەروورییەتی بوونی ئەو دەزگا و میدیایانەیە کە مەڵبەندی پێویست بۆ کەڵك بینین لە بەڵگەنامە ڕەسمییەکان تەرخان بکەن، وەك عەمبارێکی ئەساسی کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیارییەکان. بوونی سەربەستیی زانین لە مەترسیدایە گەر ڕۆژنامەنووسان هەموو ڕێگەیەکیان بۆ خۆش نەکرێ تا کەڵك لە ئەگەرەکانی ئەو سەربەستییە وەربگرن.

١١- گەرچی یاساکان لەنێوان نەتەوە و نەتەوەیەکی دیکە جیان، بەڵام مەغزا جیهانییەکەی «هەقی زانین» لەلای هەمووان ئاشکرایە و ئاشکرا تر دەبێ. یەکڕابوونێکی جیهانیی لەسەر ئەم هەقە بۆ پەرەپێدان بەو سەربەستیی زانینە، تا بڵێی پێویستە، لایەنی ئیجابیشی شەڕکردنە دژ بەسانسۆر.

١٢- هەندێ لە وڵاتان کۆسپ دەخەنە سەر ڕێگەی بەجیهانیبوونی سەربەستیی زانین کە زۆربەی وڵاتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان بەڕەسمی خۆیانی پێ دەبەستنەوە. بەڵام ئەوەیان ڕێی تێ دەچێ ببێ بەکۆسپێك لەبەردەم هاوکارییەکی سەرتاسەرییدا لە جیهاندا، لە مەیدانی مافەکانی مرۆڤدا، بازرگانیی چەك، فریاد ڕەسی لە جەنگدا، پاراستنی ژینگەدا، کە دیارە گەیشتن بەزانیاری لەم

بوارانەدا چەند پێویستە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە وڵاتان سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی قاتوقڕی یان ململانێ ناوخۆییەکان زانیاری دەشارنەوە، ناهێڵن کەس لەو شوێنانە نزیك ببێتەوە کە مافەکانیان تیا پێشێل کراوە و بەردەوامیشە، جگە لە شاردنەوەی زانیاری سەبارەت بەمەسەلە پیشەسازی یان ئەتۆمییەکان.

١٣- دواجار ناتوانین ئەوە لە یاد بکەین کە مەسەلەی گەیشتنی ڕۆژنامەنووسان بەزانیاری، مەسەلەی سەلامەتیی پیشەگەرییانەیە؛ چونکە لە زۆریەی وڵاتان ڕۆژنامەنووسان دووچاری هەڕەشە و تۆقاندن و کوشتن دەبن تەنیا لەبەر ئەوەی پەیڕەوی «هەقی زانین» دەکەن. بۆ نموونە: لە «پیرۆ»دا، ڕۆژنامەنووسان دەکوژرێن؛ چونکە ویستوویانە بزانن کە بەڕاستی چی لەو ناوچانە ڕوو دەدات کە سوپا یان گەریلاکان کۆنترۆڵیان کردوون و خەڵکیشیان لەو حەقیقەتانە ئاگادار کردووەتەوە.

١٤- پەنا بردنە بەر توند و تیژی، دوا هێرشە دژ بەفەلسەفەی «هەقی زانین» کە زۆر پێویستە بۆ هەموو گفتوگۆ و دیالۆگێکی دیموکراتییانە، بۆ بڕیاردان لەسەر هەر مەسەلەیەکی چارەنووسساز. بەڵێ پەنابردنە بەر کوشتنی ڕۆژنامەنووسان و تۆقاندنیان یەکێکە لە شێوە هەرە زاڵەکانی سانسۆر.

**سەرچاوە**

International Federation of Journalists

information

Right to Know?

Jean Paul Marthos

June- 1992

**پاشبەند:**

* فیدراسیۆنی جیهانی بۆ ڕۆژنامەنووسان، بۆتە بڵندگۆی ڕۆژنامەنووسان لە پێنج کیشوەردا. لە ساڵی (١٩٥٢)ەوە دامەزراوە. ئێستا لە ٥٧ وڵاتدا (٧٢) لقی سەر بەو فیدراسیۆنە هەن، پتر لە ٢٥٠.٠٠٠ دووسەد و پەنجا هەزار ڕۆژنامەنووسیش بوونەتە ئەندامی ئەو فیدراسیۆنە.
* ئەو فیدراسیۆنە سیاسەتی هاریکاریی ڕەپێش کردووە تا سەر ئاستی نێو دەوڵەتی کە هەموو بەیەکەوە هەوڵی ئەوە بدەن سەربەستیی چاپەمەنی ببێ بە حەقیقەت و یەکێتییەکی پتەو و سەربەست و سەربەخۆی ڕۆژنامەنووسان بەیەکەوە بنێن.
* هەموو چەشنەکانی جوداخوازی ڕەت دەکاتەوە، هەر جوداخوازییەك لەسەر ئەساسی توخم، بیروبڕوا، ئاین، ڕەنگ و ڕەگەز بەند بێ. بڕوای بەسەربەستیی ڕا دەربڕینی ڕامیاری و کەلتووری هەیە، بەرگریش لە سەندیکاکانی کرێکاران و پیشەگەران دەکا و مافەکانی مرۆڤ دەپارێزێ لەهەر شوێن و کاتێ کە بەر هەڕەشە بکەوێ.
* لەسەر ئاستی جیهانی و لەنێو هەموو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا،

بەناوی ڕۆژنامەنووسان دەدوێ، بەتایبەتی بۆ نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان (یونسکۆ، ILO، نەتەوە یەکگرتووەکان)، دەبێ بەرێ خۆشکەر بۆ گواستنەوەی زانیاری لە نێوان ئەندامانی ڕێکخراوەکانی وڵاتانی جیاوازدا، هەوڵ دەدا پشتگیریی ڕۆژنامەنووسان و یەکێتییەکانیان بکا هەر کاتێ تووشی چەرمەسەری و چەوسانەوە بن، هەر کاتێ بیانەوێ لەپێناو هەقی پیشەگەرییانەی خۆیاندا بجەنگن.

- سیاسەتێکی بنەڕەتی کە کۆمیتەی باڵا بڕیاری لەسەر دەدا کە ئەگەر بکرێ هەر سێ ساڵ جارێك کۆ ببنەوە و لەلایەن سکرتاریەتی گشتییەوە جێبەجێ بکرێ کە مەڵبەندەکەی لە بڕەسێلس-ە، لەژێر سەرپەرشتیی کۆمیتەیەکی جێبەجێکەردا بەڕێوە دەچێ.

پەراوێز:

١- وشەی «جۆرنالیزم» لە وشەی فەرەنسی (Jour)ەوە هاتووە کە واتای «ڕۆژ» دەگەیەنێ (Journal)یش واتای «ڕۆژنامە» دەگەیەنێ.

٢- ڕۆژنامە بەدەسەڵاتی چوارەم ناوزەند کراوە، سەرچاوەی ئەو دەسەڵاتی چوارەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دەمەتەقێیەکانی «ئەدمۆن بێرک» کە لەسەر سەربەستیی چاپەمەنی و لە ساڵی ١٧٧١ لەنێو ئەنجومەندا سازی دەدا، بێرك دەیگوت: لە پەرلەماندا سێ دەسەڵات هەیە بەڵام چوارەمیان لە هەمووان بەدەسەڵاتترە.

سەرچاوەکان:

نامیلکەی


1- Right to know? Jean Paul Marthoz/ June- 1992.
2- Purnell's New English Encyclopedia vol. 7 No:16